# نهێنی ژیانی قورئان خوێنان

ئامادەکردن و وەرگێڕانی
سوهەیب جەمیل عەلی



بسم الله الرحمن الرحيم

# نهێنی ژیانی قورئان خوێنان

ئامادەکردن و وەرگێڕانی
سوهەیب جەمیل عەلی

هەرێمی کوردستان/هەولێر

ناوی کتێب: نهێنی ژیانی قورئان خوێنان

ئامادەکردن و وەرگێرانی: سوهەیب جەمیل عەلی

تیراژ : (١٠٠٠) دانه

تایپ : دایکی دانیه

دیزاین و دارشتنی بەرگ : سەرکەوت عەزیز بالیسانی

**ژمارەی بەرهەم:** (١١٧)

**نرخ:** (٣٠٠٠) دینار

**ژمارەی سپاردن** : لەکتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارە ( ٦٨٠ )

**سالی ٢٠١٢ ی** زایینی دراوەتێ ..

بسم الله الرحمن الرحيم

پێشەکی بە پێنووسی بانگخواز (حاجی کاروان)

بەهرە خەڵات کراوەکانی پەروەردگار بۆ بەندەکانی بێ شوماره بەکارهێنانی بەندە چاکەکانیش بۆ خزمەت کردنی دینەکەی یەکێکە لەو خەڵاتە تایبەتانەی کە پێی جوان ئەبن دەنگ خۆشی خەڵاتی جوانی پەروەردگارە وە بەکارهێنانی ئەو دەنگ خۆشەش بۆ خزمەت کردنی قورئان خەڵاتێکی تری تایبەتی خوا گیانە، ئەم مامۆستا بەرێزانەش لە ماوەی ژیانیان دەنگ وقورگی خۆیان بەکارهێناوە بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی خوای گەورە ،ئەتوانی ناویان بنێن(ئوممەت)(خێرترین)ی مرۆڤەکان بە پێی فەرموودەی (خَيْرُكُم مَن تَعَلَّمَ القُرْآن وَعَلَّمَهُ)... ئەم کتێبە جوان و بەپێزەی کە برای وەرگێڕ و نووســــــەرکاك ( صهيب جميل علي) ماندوو بوونی کێشاوە ناساندنی خزمەتکارانی قورئانە بە نەوەی نوێ بە شێوازێکی ناسك وجوان چونکە ئێمە زۆربەمان

گوێمـان لـه دەنگیـان ئـەبێ بـەلاّم نایـان ناسـین ئـەم کتێبـەش بۆ ناسینی ئـەم مامۆستایانەیە جێـی خۆیـەتی دوعایان بۆ بکەین کـە خـوا لـە خۆشەویستانی خۆیانی بژمێرێ و سـەرکەوتنیش بـۆ بـرای ئامادەکـار و وەرگێـڕ ئەخوازین و خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە.

حاجی کاروان
٢٠٠٧/٥/١ ـ هەولێر
www.bextewery.net

# بەشی یەکەم :

## ژیانی گەورە قورئان خوێنەکانی جیهانی ئیسلامیی .. بەرواری وەرگێڕان ٢٠٠٦ - ٢٠٠٧





﴿ محمـــد رفعت ﴾

سـەرەتاو کۆتـایی قورئـان خوێنـان و گـەورەی هـەموو قورئـان خوێنێکە، ئـەم مرۆڤـە مەزنـە لـە سـاڵی (١٨٨٢) ی زایینـی لـە گەڕەکی (مغربلین) ی قاهیرەی پایتەختی میسر لە دایك بووە، لە تەمەنی پێنج ساڵان باوکی ڕەوانەی لای چەند مامۆستایەکی کردووە، بۆ فێربوونی قورئانی پیرۆز و تەمەنی نەگەیشتۆتە دە ساڵان هـەموو قورئـانی لەبـەرکردووە.. هـەروەها لـە تەمـەنی شانزە ساڵان قورئان و ماناکانی بەڕەوانی لەبەرکردووە، لەگـەڵ تەجویدێکی پوخت و جوان. لەوکاتەوە ناوبانگی دەرکردووەکـە لە شەوانی ڕەمەزانی پـیرۆزدا لـە پرسـەو ئاهەنگـەکان دەسـتی کردووە بە قورئان خوێندن..

شێخ (محەمـەد رەفعـەت) لـە سـاڵی ١٩٠٨ کـە تەمـەنی شـازدە ساڵان بـووە تـوانی سـەرنجی خـەڵکی بۆخـۆی ڕابکێـشێ،

بەتایبەتی لەوکاتەی مەقام بێژەکانی ئەوسای میسر (ئەبولعەلا محەممەد و عەبدۆحامولی و محەممەد عوسمان فستقی) زۆر پێی سەرسام بوون و ناویان نا قورئان خوێنی یەکەم و کۆتایی میسر لە رۆژهەڵات و رۆژئاواو باکوور و باشور.

یەکەم قورئان خوێن بووە، کە قورئانی لە رادیۆی ئەهلیی میسری خوێندبێ ئەویش لەسەر داوای کەسایەتی ناوداری میسری (محەممەد عەلی) بوو لە ساڵی ( ١٩٣٤) و بۆ یەکەمجار قورئانی تۆمارکردبێت لەسەر داوای کەسایەتی (زەکەریا پاشا و حاجی محەممەد خەمیس) ی گەورە بازرگان بوو لەوکاتەی سورەتەکانی (کەهف و مەریەم) ی خوێند، پاشان رادیۆی (BBC) بەریتانی داوای لێکرد سەردانی ئێزگەکەیان بکات بۆ تۆمارکردنی قورئان، بەڵام شێخ محەممەد رەفعەت ڕەتی داواکەی کردەوە و پێی وابوو بۆ ڕادیۆی بیانی حەرامە قورئان بخوێنێت، بەڵام شێخ (مەراغی) شێخی ئەوسای ئەزهەر لە فەتوایەکدا پێی ڕاگەیاند کە حەرام نیە و خێرێکی گەورەیە و ئەویش ڕەزامەندی نیشاندا و سەردانی ڕادیۆکەی کردو لەسەر دوو ئەستوان سورەتەکانی (کەهف و مەریەم و یوسف) ی تۆمارکرد.

شـێخ محەممـەد ڕەفعـەت لـە ژیانیـدا زۆر ئـارەزووی نـەدەکرد بچێتە ئێزگەکان، هەردەم دەیوت حەزدەکەم سەردانی مزگەوت بکەم نەك ئێزگە، چونکە لە مزگـەوت بـە دیـداری ئـازیزانم شـاد دەبم و خۆشـحاڵ ئـەبم ... شـێخ محەممـەد لـە سـاڵی ١٩٠٥ خێزانـی پێکهێنـا،خوای گـەورە پێـنج منـداڵی پـێ بەخـشی ، گەورەکەیان لە ساڵی ١٩٠٦ لە دایك بوو بەناوی (مـەحمود) کـە لـە تەمـەنی بـچووکیەوە گیـانی لەدەسـتدا، پاشـان محەممـەد لەسـاڵی ١٩٠٩ و ئەحمـەد لـە سـاڵی ١٩١١ و زەینـەب لـە سـاڵی ١٩١٤ و حسێن لە ساڵی١٩١٩ کە هیچیان لە ژیان نەماون.

ئەم قورئان خوێنە لە ماوەی ژیانیدا بە هەژاری ژیاوەو بـە هـیچ شێوەیەك قورئانی نەکردۆتە هۆکارێك بۆ پەیداکردنی پـارەیەکی چـەور یـاخود بڕێـك پـارە تـاوەکو پێـی بـژیێت.. بـۆ نموونـە جارێکیان کەسایەتی ناوداری هیندی (حەیدەر ئابـاد) لەڕێگـەی (محەمـەد عەبـدلوەهاب) مـەقام بێـژی میـسری داوای لـیّ کـرد سەردانی هیندستان بکـات بـۆ خوێنـدنی قورئـان لـە ئاهـەنگێك بەرامبەر بـە پـانزە هـەزار جونـەیهی میـسری، شـێخ محەممـەد ڕەتی داواکەی کردەوەو گوتی: من بە پارە قورئـان نـاخوێنم و پەیمانم بەخوا داوە.

دەڵێن شێخ محەممەد ڕەفعەت بەچاوکراوەیی و چاوساغی لە دایک بووە، و شێوەو ڕووخسارێکی زۆر جوان و ناسکی هەبووە، بەڵام خەڵکێکی زۆر بەخیلیان پێ بردووە و هەر لە تەمەنی منداڵییەوە بەهۆی چاوزارەوە چاوێکی لەدەستداوە و بەهۆی کەم دەرامەتی کەس و کارەکەیەوە نەتوانراوە چارەسەری بۆ بکرێت. تا وای لێ هات چاوەکەی تریشی کز و لاواز بووە لە نزیکی خەڵکی ناسیوەو توانیویەتی وشەکانی قورئانی پیرۆز بناسێتەوە. مخابن لە ساڵی ١٩٣٦ ی زاینی دوای نوێژی هەینی لە مزگەوتی (سەییدی جابر) لە ئەسکەندەرییە خەڵکان بە پیرییەوە چوونەو سڵاویان لێ کردووە لەو کاتە یەکێك بە هەڵە پەنجەی بەچاوەکزەکەی دەکەوێت و پاش ژانێکی زۆر بە ماوەیەکی کەم چاوەکەی تریشی لەدەست دەدات و بە یەکجاری دنیای لەبەرچاو تاریك دەبێت.

شێخ محەممەد لە ساڵی ١٩٤٣ نەخۆشیەکی کتوپڕ و توند یەخەی دەگرێت و تا لەسەر جێگاکەی دەکەوێت، بەڵام وەنەبێ دەستبەرداری قورئان خوێندن بووبێ تاوەکو گیانی سپارد هەردەم لە خزمەتی قورئاندا بووە.. لەم ماوەیەدا هەفتەی دوو

ڕۆژ سەردانی ئێزگەی میسری دەکرد کە ڕۆژانی دووشەممە و هەینی بوو کە تێیدا ڕاستەوخۆ قورئانی بۆ گوێگران دەخوێندەوە تاوەکو ساڵی ١٩٤٨ نەخۆشیەکەی یەکجارەکی بوو و لە کاتی قورئان خوێندن هەناسەی تەنگ دەبێ و ناتوانێت درێژە بە قورئان خوێندن بدات و دەیبەنەوە ماڵەوە.. لەساڵی ١٩٤٩ نووسەر و ڕۆژنامەنووسی بەناوبانگی میسری و عەرەبی (ئەحمەد ئەلصاوی محەممەد) هەواڵی نەخۆشیەکەی دەزانێ و لە هەواڵێك کە لە ڕۆژنامە بڵاوی دەکاتەوە داوا لە خەڵکی دەکات پارەو کۆمەکی بۆ شێخ محەممەد کۆ بکەنەوە و بیدەنە دەست خودی خۆی. بەهۆی ئەو ڕۆژنامەنووسە شەیدایانی دەنگی محەممەد ڕەفعەت بڕی پەنجا هەزار جونەیهی میسری کۆدەنەوە تاوەکو شێخ چارەسەرێکی خۆی بکات. کە شێخ بەمەی زانی دلگران بوو لەوکاتەدا لە نەخۆشخانەیەکی قاهیرە بوو داوای لە چاودێرەکەی کرد کاغەزێك بێنێ، ئەویش هێنای و وتی: بینووسە: بەناوی خوای گەورە بۆ نووسەر و ڕۆژنامە نووس ئەحمەد ئەلصاوی.. سەلامی خودات لێ بێ.. سوپاست دەکەم بۆ ئەو هەموو خەمخۆر و خەڵکە هەزارە کە خەمی من دەخۆن بەڵام باش

بزانـه مـن پێویـستیم بـهم جـۆره یارمەتییانـه نییـه و ئەمـه تاقیکردنەوەیەکی خودایەو هەر خۆیشی شیفابەخشه..

پزیشکەکان هیچیان بۆ ناکرێ گەر بێتوو ئەجـەل هـات، چـونکه گیانی من بـه دەسـت کەسێکه کـه خـودای هـەموو کەسێکه و جارێکی تر سەلامی خودات لێبێت.

کـه نامەکـه گەیـشته دەسـتی رۆژنامەنووسـەکه زۆر گریـاو راسـتەوخۆ لەبـەر هەڵوێـستی بـەرزو پـیرۆزی شـێخ محەممـەد رەفعەت له رۆژنامه بڵاوی کردەوه.

شـێخ زۆر لـه خـودا ئەپاڕایـەوه بـه دەم خوێنـدنی قورئانـەوه گیـانی دەربـچێت تـاوەکو لـه سـاڵی ١٩٥٠ ی زایینـی بـه دەم قورئـان خوێندنـەوه گیـانی پـیرۆزی لـه شـەقەی بـاڵی دا.. هـەزاران سـڵاو لـه گیـانی پـاکی بێـت.. لـه قورئـان خوێندنـدا نموونەی نەبووه، لەوکاتەی گوێگر بەدیارییەوه دانیـشتایه دڵـی ئـارام دەبـوو و چـاوەکانی لـه ترسـی خـودا پـڕ دەبـوون لـه فرمێسك..شێخ محەممەد له دوای خۆی تـەنها خـانووێکی سـێ نهۆمی بەجێهێشت که دوو نهۆمی بەکرێ دابوون لەگـەڵ پارچـه زەوییـەك لـه شـەقامی (مـونیره) کـه حـەوت دوکـانی لەسـەر دروسـت کرابـوو هـەروەها لـه دوای خـۆی چـوار کاسـێتی

تۆمارکراوی بەجێهێشت لەگەڵ قەوانێك کەمۆسیقای بتهۆڤنی لەسەر تۆمارکرابوو.....



## ﴿ عبدالفتاح الشعشاعی ﴾

مرۆڤێکی ڕەوشت بەرزو بێ فیز، بەتوانا لە کارکردن، لە مەجلیسی پیران شەرمن و لەناو گەنجانیش خزمەتکار و خۆبەنزم زان ... ئەویش (عەبدولفەتاح مەحمود ئیبراهیم ئەلشەعشاع)ە، لە ساڵی ١٨٨٠ ی زاینی لە گوندی (شەعشاع) ی سەر بە شاری (منوفیە) چاوی هەڵهێناوە، لە ساڵی ١٩٠٠ کە تەمەنی دەساڵان بووە بە پوختی و بە ڕەوانی هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە. هەر لە تافی لاوێتیدا بە (مەحمود ئیبراهیم) ی باوکی سەرسام بووە و لەسەر داوای باوکی چۆتە شاری (طنطا) و لە مزگەوت و پەیمانگای (الاحمدی) فێری زانستەکانی قورئان و تەجوید بووە، پاشان ڕووی لەقاهیرەی پایتەخت کردووە و چۆتە ئەزهەر و لەسەر دەستی شێخ (بەیومی و عەلی سبیع) فێری خوێندنی قورئانی پیرۆز بووە .

پاش چەند ساڵێك گەڕاوەتەوە گوندەكەی و خەڵكی گوندەكەی بە گەرمی بە پیرییەوە چوون و پیرۆزباییان لێ كردووە.

پاشان خوالێخۆشبوو شان بەشانی شێخ (زكريا أحمد)ی گەورە ئاوازدانەری ئەوسای میسری تیپێكی تەواشیح خوێندنیان دامەزراندو لەزۆربەی بۆنە ئایینیەكان بەشدارییان كردووە.

## شێخ (عەبدولفەتاح) چۆن لەناو خەڵكی ناوبانگی دەركرد؟

شەوێك لە شەوان بەر لەساڵی ١٩٢٠ لە مزگەوتێكی قاهیرە ئاهەنگێك بۆ یادی لەدایك بوونی ئیمامی حوسێن بە بەشداری ناودارترین و گەورەترین قورئانخوێنانی ئەو سەردەمە سازكرا كەئەوانیش: (شێخ محمد رفعت، ئەحمەد نەدا، عەلی مەحمود، شێخ عیساوی، محەممەد جادەڵڵا) لەم شەوەدا شێخی خوالێخۆشبووش بە خوێندنی چەندئایەتێك لە قورئانی پیرۆز بەشداری كردو ئاهەنگەكەی بەرزتر ڕاگرت ، تا وای لێهات ئامادەبووانی ئاهەنگەكە سەرسام بوون و بە (ألله ألله) پێشوازیان لە دەنگە خۆش و بەجۆشەكەی كرد.

قورئان خوێن (عبدالفتاح الشعشاعی) لە ساڵی ١٩٣٠ بە یەكجارەكی وازی لە تەواشیح و سرود وتن هێناو بە تەنها ڕووی

له قورئان خوێندن کرد و هەروەها له گیرفانی خۆی تیپەکەی جارانی پارەدار دەکرد.

هەروەها بۆ یەکەمجار لەساڵی ١٩٣٦ قورئانی بەشێوەی راستەوخۆ خوێند ، ئەمەیان چۆن بوو؟

سەرەتا بە گوزارشتی ناوبراو قورئان خوێندن له ئێزگە حەرامە...!!! بەڵام شێخی ئەوسای ئەزهەر (شێخ زەواهیری) ئەم بۆچوونەی بە هەڵە لێکدایەوەو پێی وت : کە قورئان خوێندن له ئێزگە حەرام نییە و خەڵکانێکی زۆر بە گوێگرتنی دەنگت سوودمەند دەبن، شێخ (محمد رفعت)یش زۆر هانیدا و پاشان ڕووی لە ئێزگە کرد و دایانمەزراند و ساڵانه پێنج جونەیهی میسرییان وەك مووچە بۆ بڕییەوە.

لەهەمان ساڵ ڕووی له کۆشکی پاشایەتی کردو قورئانی خوێند ، ئەو کاتە مانگی رەمەزان بوو، پاشان سوێندی بە خودای گەورە خوارد کە بە هیچ شێوەیەکی تر ڕوو لە کۆشکی پاشایەتی نەکات و دەیوت ( لەلایەك قورئان بخوێنم و لە سوچێکی کۆشکەکەش پاشا کاری بەدڕەوشتی ئەنجام بدات؟!)

له بارەی قورئـانخوێن (محمـد رفعـت)ه،وه دەیگـوت نموونـەی نییه و قوتابخانەیەکه بۆ فێربوونی قورئانی پـیرۆز و بـه مردنـی ئـەو قوتابخانـه کـه کۆتـایی هـات و کەسـی تـر نییـه شـوێنی بگرێتەوه تا کۆتایی دنیا.

له کۆتایی سییەکاندا سەردانی عێراق دەکات، ئەمـەیان لەسـەر داوای کێ بوو وه چۆن بوو؟

شێخ (أبو العنین) دەگێڕێتەوه و دەڵێت :

له ڕێگەی باڵیۆزی عێراق له قاهیره ئاگـادار کراینـەوه کەشـاژنه (عالیه)ی عێراقی کۆچی دوایی کردووه و دەبێ قورئان خوێنێك بگەیەنینه بەغدا بـۆ بـەرز ڕاگرتنـی پرسـەکەو قورئـان خوێنـدن تیایدا..

دەڵـێ یـەکێك لـەوان مـن بـووم منـیش حـەزم کـرد (مـستەفا ئیـسماعیل) هـاوەڵم بێـت لـە گەشـتەکەدا، بـەڵام زۆر بەدوایـدا گەڕام نەمدۆزییەوه، بەناچاری خۆم گەیانده لای بالیۆزی عێراق و وتم: شێخ (مستەفا ئیـسماعیل)م، نەدۆزییـەوه ئـەویش وتـی: گوێ مەدەرێ باشترین قورئان خوێن دەکەمـه هاوسـەفەرەکەت ئەویش (عبدالفتاح الشعشاع)یه.. (أبو العنـیین) دەڵـێ: منـیش سەرم سوڕما لـه کاتێکدا لەگـەڵ نـاوبراو قـسەم نییـه و چـەند

ساڵێکە پەیوەندیمان پچڕاوە، بەڵام بە هۆی گەشتەکەوە لە ڕێگەی (فوئاد سیراجەدین) ی وەزیری ئەوکاتەی میسر پەیوەندییەکانمان ئاسایی بۆوەو ئاشت بووینەوە.

هەروەها (ابو العنیین) دەڵێ گەشتەکەمان دەستی پێکردو گەیشتینە فڕۆکەخانەی بەغداو خەڵکێکی زۆر بەدەورمان کۆبوونەوەو دەیانگوت کوا (مستەفا ئیسماعیل)؟ کوانێ (مستەفا ئیسماعیل)؟ بەم پرسیارانەی خەڵکی شێخ (عەبدولفەتاح) دڵگران بوو و گوتی: هەر ئێستاکە دەبێ بگەڕێینەوە قاهیرە!! چونکە ئەو خەڵکە ئێمەیان خۆش ناوێ و کەسێکیان خۆش ئەوێ کە لەکۆشکی پاشایەتی قورئان دەخوێنێ؟!

(أبو العنیین) دەڵێ: زۆرم تکاکرد و هێمنم کردەوە پاشان گەیشتینە هۆتێلێکی بەغداو پشوێکمانداو شێخیش هەر لەسەر داواکەی خۆی مکوڕ بوو و دەیگوت سبەی زوو دەگەڕێمەوە قاهیرە.. چونکە بەو پرسیارانەی خەڵکی (عەبدولفەتاح) تا درەنگی شەو نەخەوت و دەگریا گوایە ڕێزی قورئانخوێنی بەتەمەن ناگرن؟!

ناوبراو دەڵێ: پاشان بەرەو کۆشکی کۆماری بەڕێکەوتین کە لەوێ پاشا و ئەفسەرو وەزیری گەورەو کاربەدەستی میری دانیشتبوون.. لەبەرامبەر ئەواندا شێخ (عەبدلفەتاح شەعشاعی)دەستی بە قورئان خوێندن کرد و زۆربەیان سەریان سوڕما و ڕێزێکی زۆریان لێناین، کە ئەمەیان بووە هاندەرێك هەرسێ ڕۆژ لە پرسەکە دابنیشین..

(أبوالعنین) دەڵێ کە شەو گەڕاینەوە میوانخانە خەیاڵێك بە مێشکمدا هات و چەند پرسیارێك لە ناخی دڵەوە هەڵقوڵاو چوومە تەنیشت (عەبدولفەتاح) و گوتم: ئایا تۆ ڕازیت بەوەی کە گەڕایەوە پرسیارت لێبکەن لەبەرچی سەرنەکەوتوویت و نەتتوانیوە قورئان بخوێنی و عێراقییەکان بەتۆ سەرسام نەبوون؟ ئەویش گوتی تۆ بە تەمەن زۆر لەمن بچووکتری چۆن ئەو جۆرە پرسیارەت بە مێشکدا هات کە من گەورەترم و ئەم پرسیارەم لە خودی خۆم نەکرد؟!

پاشان بەهۆی ئەو پرسیارەی من زیاتر خرۆشاو شەوی دواتر تا درەنگانی شەو بە دەنگی بەرز قورئانی خوێند کەوا هەستت دەکرد باڵی گرتووە و لەناوەوەی بەهەشتە!! هەربەو هۆیەش هەفتەیەك لە بەغدا ماینەوە و چەندین خەڵاتی (رافیدین) مان

وەرگرت و لەو ساتەوە لەعێراق ناوبانگی دەرکرد و سەردانی ئێزگەی عێراقی کردو بوو بە یەکەم قورئان خوێنی ئێزگە و تا کاتی مردنیشی وەك وەفایەك بەرامبەر بە خەڵکانی بەغدا سەردانی عێراقی دەکرد..گەورەترین یادگاری لە مێژووی قورئان خوێن (شەعشاعی) ئەوەبوو کە یەکەم کەس بووە لە ڕێگەی بلّندگۆ (مکبرە) ی مزگەوتی حەرام و مزگەوتی نەبەوی قورئانی خوێندبێ، ئەویش لە ساڵی ١٩٤٨ی زایینی بوو.

خوالێخۆشبوو لە ١١/١١/ ١٩٦٢ لە تەمەنی حەفتاو دوو ساڵیدا تەمەنێك هەمووی لە خزمەت قورئان ، ژیانێك لە خزمەتی قورئان و زانستەکانی قورئان ڕۆحە پاکەکەی سپاردەی خودا کرد، چەندین قورئان خوێنیش لەسەر دەستی ئەو بوونەتە بەناوبانگترین قورئان خوێنی ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامیی، ئەوانیش (شێخ مەحمود عەلی ئەلبەننا و ئەبو العنیین) و چەندین قورئان خوێنی تریش کە ئێستا هەندێکیان لە ژیاندا ماون.



وێنەی قورئان خوێن لەکۆتایی ڕۆژەکانی تەمەنی

لەساڵی ١٩٦٢



لەکاتی خوێندنی سورەتی ( الفاطر و البينة ) لەعێراق

ساڵی ١٩٥٨ ی زایینی



## ﴿ صديق المنشاوي ﴾

ناوی تەواوی (صدیق السید تایب المنشاوی) یەو لە ساڵی ١٨٩٨ ی زاینی لە گوندی (المنشأه) ی سەر بەپارێزگای (سوهاج) لە دایك بووە، شێخ صدیق هەر لە منداڵییەوە موعجیزەیەك بوو بۆ دەوروبەری و باوكی بەتایبەتی، چونكە لە تەمەنی (٩) ساڵان لەلای باوكی هەموو قورئانی بە ڕەوانی لەبەركردووە و لەو تەمەنە بچووكەیدا توانیویەتی ماناكانی بزانێ.. پاشان خوالێخۆشبوو ڕەوانەی لای (شێخ مەسعودی) كراوە كە ناوبراو بەناوبانگترین كەسایەتی ئەو سەردەمە بووەو پسپۆڕ بووە لە زانستەكانی تەجوید و چۆنیەتی خوێندنی قورئانی پیرۆز..

دوای ئەوەی لەلایەن شێخ مەسعودی مۆڵەتی پێدرا ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ئەزهەرەوە كرد، لەوێ فێری زانستەكانی شەرع و

قورئان و زمانەکان بووە. شێخ صدیق بە بەردەوامی لەگەڵ شێخ (محەمەد رەفعەت و ئەحمەد نەدا و شێخ مەنسور و شێخ عەلی مەحمود) هەڵسوکەوتی دەکردو پەیوەندی پتەویان هەبوو، ئەمانە ئەوساتە بەناوبانگترین قورئان خوێن و مەداحی ئەو سەردەمەبوون، هەروەها بە بەردەوامی دەرگای بەرامبەر بەهەژاران و نەداران کراوەبووە و خواردنی بۆ ئامادەکردوون، تا وای لێهات بە (ملیۆنێر) ناوبانگی دەرکرد..

شێخ (صدیق) بە هیچ شێوەیەك ڕووی لە ئێزگەکان نەدەکرد، بەڵکو ئێزگەکان بە پیرییەوە دەهاتن و لە مزگەوتی گوندی (عسیرات) نزیکەی بیست کاسێتیان بۆ تۆمارکرد، بەلاّم بەداخەوە زۆربەیان ون بوون و هەندێکیان شتی تریان لەسەر تۆمارکرا. جارێکیان (محەممەد ئەمین حەمماد) ی سەرۆکی ئێزگەی میسری زۆر تکای لە شێخ کردو وتی: دەبێ بێیتە ئێزگەو قورئان تۆمار بکەیت، بەلاّم شێخ ئەمەی رەتکردەوەو، وتی دەگەڕێمەوە قاهیرە دەمەوێ بە دیداری ئازیزەکەم (محەممەد)ی کوڕم شادبمەوە کە ئەوساکە ( شێخ صدیق ) لە پارێزگای (صعید) بوو.

خوالێخۆشـبوو لەسـاڵی ١٩٢٤ی زاینـی چـۆتە مـاڵی خـودا و فەریزەی حەجی پیرۆزی بـەجێهێناوە گەشتەکەیشی بەسـواری وشترەوە بووە، لە ساڵی ١٩٥٣ بەتەواوەتی ناوبـانگی دەرکـرد، لەو کاتەی لە شـەوانی رەمـەزان قورئـانی دەخوێنـد لـە هـەموو ئاهەنگێکی قورئان کورەکانی لەگەڵ خۆی دەبرد و دەیگوت بـا نور و خۆشەویستی قورئـان بـچێتە دڵیـان. شـێخ صـدیق هـیچ دیـاری و رێزلێنـانێکی مـیری پـێ نەبەخـشرا، چـونکە پابەنـدی بڕیارەکانیان نەدەبوو و هەردەم دەیگوت: ( من پێویستم بەهیچ جۆرە دیاری و رێزلێنانێـك نیـە، بـەڵکو جـوانترین خـەڵات و رێزلێنان کە بەختەوەرم دەکات خۆشەویسـتی خەڵکییـە بۆ من! ).

لـە ژیانیـدا خـودا دوو دیـاری پـێ بەخـشی کـە یەکـەمیان (محەممـەد)ی کـوڕی بـوو لەسـاڵی ١٩٢٠ کـە ئـەمڕۆ بـە بەناوبانگترین قورئان خوێن دادەنرێ لـە سەرانسەری جیهـانی ئیسلامیدا..

دووهـەمیان (مـەحمود) ی کـوڕی کەئێـستا لـە ژیانـدا مـاوە و شوێنی باوکی و براکەی گرتۆتەوە.

شـێخ صـدیق لـە مـاوەی ژیانیـدا سـەردانی هـیچ وڵاتێکـی نەکردووە، چونکە هەردەم لەگەڵ دوو کوڕەکەی دادەنیشت و قورئانی پیرۆزی پێ دەخوێندن و هەوڵیدەدا لەبەری بکەن.. هـەروەها لـە ڕادیۆکانی میسر و سوریا و (BBC) بـەریتانی قورئـانی تۆمـار کـردووە.. چـەندین قورئـان خـوێن ناویـان نابوو(أمين القرآن). ئەم زاتە پیرۆزە لـە مـانگی ئـەپڕیلی ساڵی ١٩٨٤ لە تەمەنی ٨٦ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، کە لـە دوای خۆی توانی ئەرشیفێك بەجێ بهێڵێ، کە پڕن لە حیکمەت، پـڕن لە خێرو بەرەکەت ئەویش بە دەیان کاسێتی دەنگی، لەگەڵ یادگارییەکانی خۆی کە ڕۆژێك لەڕۆژان سـەری بـەرزی بۆ هـیچ پاشاو سەرۆکێك کەچ نەکردو قورئـانی نـەکردە وەسیلەیەك بۆ پەیداکردنی پارەو پوول ..



## مصطفى اسماعيل

ئەم قورئان خوێنە لە گوندی (متين غزال) ی پارێزگای (طنطا) لەبەروای ١٩٠٥/٦/١٧ ی زایینی لەدایك بووە، باوکی جووتیار بووە و زۆر حەزی کردووە کوڕەکەی قورئان لەبەر بکات، هەر بۆیە تەمەنی گەیشتۆتە پێنج ساڵان ناردوویەتیە لای شێخ (عبدالرحمن نەجار).. شێخ مستەفا زۆر زیرەك و چاو کراوە بوو، توانی لە ماوەیەکی کورت و لەتەمەنێکی زوو فێری قورئان خوێندن ببێ و لەبەری بکات.

خوالێخۆشبوو نوور و ڕۆشنایی قورئانی چووە دڵەوەو وانەکانی دیکەی قوتابخانەی کەم دەخوێند و زیاتر ئارەزووی لەبەرکردنی قورئانی دەکرد، باپیرەیشی زۆر هانی دەدا و لە ترسی باپیرەی کە بە گاڵتە پێی دەگوت: قورئان لەبەر نەکەی ئازارت دەدەم، ئەم قسانە و هەڕەشەی گاڵتە ئامێزەکانی باپیرەی زیاتر بوونە هۆکارێك تاوەکو مستەفا بتوانێ هەموو

...ان لەبەر بکات، باوکیشی بە پەلە ئەم مزگێنییەی بە بابە ...ورەی ڕاگەیاند کە مستەفا چ منداڵێکی زیتەڵ و زیرەکی لێ ...ەرچووە، بۆیە باپیرەی زۆر دڵخۆش بوو و بڕیاریدا ڕەوانەی مزگەوتی (الاحمدی) بکەن، بۆ فێربوونی زانستەکانی تەرتیل و تەجوید و چۆنیەتی خوێندنەوەی قورئان.

شێخ(مستەفا ئیسماعیل) لەوکاتەدا ناوبانگی دەرکرد کە لەساڵی ١٩٢٢ لە پرسەیەك بەشداری کردو، تەنها کەسێك هانی دابێت لەو دانیشتنەدا ئەویش گەورەی قورئان خوێنان شێخ (محەممەد ڕەفعەت) بوو، ڕەحمەتی خوای لێ بێت.. پاش ئەوەی شێخ (ڕەفعەت) قورئانی خوێند شێخ (مستەفا)ش لە شوێنی دانیشت و دەستی کرد بەقورئان خوێندن.. شێخ (محەممەد ڕەفعەت) زۆر بە وردی گوێی لێ گرت و سەری سوڕما و بەخاوەن پرسەکەی وت: لێی گەڕێن با بخوێنێ، نزیکەی کاتژمێر و نیوێك بەردەوام بوو، پاشان شێخ ڕەفعەت چووە بەردەمی و ماچی کردو وتی: کوڕەکەم خوێندنەوەت زۆر باشە و دەنگێکی خۆشت هەیە.. بەڵام یەك ئامۆژگاریت دەکەم زیاتر هەوڵبدەو لاسایی کەس نەکەیەوەو نیەتت تەنها ڕەزامەندی خودا بێت و بەس..

هەر بۆیە ئامۆژگارییەکانی شێخ (محمد رفعت) کاریگەری زۆری کردە سەر شێخ مستەفا و بە بەردەوامی ڕووی لە مزگەوتی (الاحمدی) کردو تەمەنی نەگەیشتە هەژدەسالآن هەموو قورئانی بە ڕاڤەو ماناو تەجویدو تەرتیل لەبەرکرد و لە پەیمانگای (الاحمدی) یش درێژەی بە خوێندندا..

شێخ مستەفا بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٤٣ ڕووی کردە قاهیرەی پایتەخت و لە سەر داوای شێخ (محەممەد صیفی) بەشداری لە ئاهەنگێك کرد کە لەوکاتەدا شێخ (عەبدولفەتاح ئەلشەعشاعی) ئامادەبوو، شێخ (محەممەد صیفی) بە ئامادەبووانی ناساند و وتی بخوێنە، خوالێخۆشبوو دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی (التحریم) کە نیو کاتژمێری خایاند و سەرجەم ئامادەبووانی سەرسام کرد، هەندێکیان لە پرمەی گریانیاندا..

شێخ (مستەفا) لە ژیانیدا سەردانی ئەم وڵاتانەی کردوو و بەشداری کردووە لە دەیان ئاهەنگی قورئان خوێندن، لەوانە: (سوریا ، عێراق ، ئەندەنوسیا ، پاکستان ، فەلەستین ، ئەڵمانیا ، فەرەنسا ، لەندەن).

له ماوەی ژیانیدا وەزارەتی ئەوقافی میسری بە قورئـان خـوێن لــه مزگــەوتی (الاحمدیــه) و (الازهــر) و كۆشــكی پاشــایەتی دایمەزراندووه.

شێخ مستەفا بەر لە مردنی زۆر هیوای دەخواست هەروەكو زۆر لە قورئان خوێنان ئاواتیـان بـوو خـوای گـەوره بـەدەم قورئـان خوێندنـەوه بیمرینێـت، هـەردەم ئـەم نزایـەی دەكـرد (أللــهم لاتحرمني من التلاوة حتى ألقاك)، بەر لە كۆچی دواییشی دوایـین ئاهەنگی قورئان خوێندنی لە شاری (دمیاط) بوو.

## چۆنیەتی كۆچی دوایی كردنی:

كاتــژمێر (٩) ی بـەیانی ڕۆژی هـەینی بـوو لـه بـەرواری ١٢/٢٦ ١٩٧٨، كچەكە داوەتێكی بۆ سـازكردبوو تـاوەكو بگاتـه شـاری (دمیاط)، شـوفێرەكەی دەگێڕێتـەوه لـه ڕێگـادا بـووین بگەینـه ماڵی كچەكەی بەدەم قورئان خوێندنەوه هەناسەی تەنگ ئـەبێ بـەلام هـەر بـەردەوام دەبـێ.. تـاكو دەگەینـه مـاڵی كـچەكەی راســتەوخۆ لــه جێگــا دەكــەوێت و پەیوەنــدیمان بــه چــەند پزیــشكێك كــرد و بــه دەم داواكەمانــەوه هــاتن و یەكــسەر

گواستیانەوە نەخۆشخانەی ئەسکەندەرییە، بەڵام بەداخەوە پزیشکەکان هیچیان بۆ نەکراو گیانی سپارد.

شێخ (مستەفا ئیسماعیل) پاش وەفاتی چەندین کاسێتی تۆمار کراوی بەجێهێشت بە شێوەی تەرتیل و تیلاوە، کە بوونە ئەرشیفێکی مەزن لە مێژووی ئەم قورئان خوێنە بلیمەتە..



قورئان خوێن مستەفا ئیسماعیل ١٩٤٨



﴿ محمود خليل الحصري ﴾

بەهەقیقەت خزمەتکاری قورئانە.. قوتابخانەیەکی مەزنە بۆ فێربوونی قورئانی پیرۆز، یەکەم کەسە لەئێزگەی وڵاتەکەی کە قورئانی بە شێوەی تەرتیل تۆمارکردبێ و خاوەنی (المصحف المعلم)ە، هەروەها تاکە کەسێکە توانیویەتی لە ناوەوەی کۆشکی سپی ئەمریکیدا قورئانی پیرۆز بە دەنگێکی بەرز بخوێنێت.

ئەم قورئان خوێنە کەم وێنەیە لە گوندی (شبر النملە)ی سەر بە مەڵبەندی (طنطا)ی پارێزگای غەربی لە ساڵی ١٩١٧ ی زاینی لەدایك بووە، لە تەمەنی چوار ساڵان دەستی کردووە بەلەبەر کردنی قورئانی پیرۆز و تەمەنی گەیشتە هەشت ساڵان کە دەکاتە ساڵی ١٩٢٥ هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە..!!

بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٢٨ واتا لە تەمەنی پانزە ساڵان (شێخ الخضر) ی دەستی بردە گیرفانی و بڕی سی قرشی پێداو زیاتر هانیدا تاوەکو بەردەوام بێت و بە شێخ حصری وت: لەلام بمێنەوە تا دوای جەژن، بەڵکو پارەی زۆرترت پێ بدەم لەگەڵ جەژنانە. خوالێخۆشبووش لەوکاتەدا کە مانگی رەمەزان بوو لە خوێندنی قورئان بەردەوام بوو، پاشان تا درەنگانی شەو و تا دوای ماندوو بوونێکی زۆر خەوی لێ دەکەوت کە خزمەتکارانی شێخ خواردنیان بۆ دەهێنا، لەبەر نووستن بەئاگا نەدەهات کەهەڵدەستا دەیبینی سەگەکەی ماڵی شێخ خواردنەکەی خواردووە.

## ( محمود خليل الحصري ) کەی پەیوەندی بە ئێزگە کردووە؟

بۆ یەکەمجار لە بەرواری ١٦ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٤٤ بە شێوەیەکی راستەوخۆ لەئێزگە قورئانی خوێندو سەرکەوتنی وەدەستهێناو پلەی زۆرباشەی مسۆگەرکرد..

لە ساڵی ١٩٤٨ بە بڕیاری میریی بە بانگدەر لە مزگەوتی (سیدی حمزە) دامەزرا، بەڵام شێخ حصری ئەم بڕیارەی بە دڵ نەبوو و حەزی دەکرد بە قورئان خوێن دابمەزرێ، ئەم بڕیارە لە بەرواری ١٩٤٤/٨/٧ دەرچوو، پاش داواکەی خۆی لە

بەرواری ١٩٤٨/١٠/١٠ کرا بە قورئان خوێن شـان بەشـانی شـێخ (عبـدالمتعال)، پاشـان لـە بـەرواری ١٩٤٩/٤/١٧ گوازرایـەوە مزگـەوتی (سـید أحمـد البـدوی) لەشـاری (طنطـا)، ئینجـا بـۆ مزگەوتی (الاحمدي) تاوەکو ساڵی ١٩٥٥ی زاینی.

یەکـەم کـەس بـووە کـە توانیویـەتی چـەندەها جـۆر خـەتمی قورئانی پیرۆز تۆمار بکـات لـە سـتۆدیۆکانی ئێزگـەی میـسری، ئەویش لەساڵی ١٩٦٠ ی زانیی بـوو، خەتمـەکانی بـەم شـێوەیە بـوون (خـەتمی تـەرتیل) بـە دوو شـێوە یەکێکـــــــــیان بـە ریوایـەتی ( حفص ) دووهەمیان بە ریوایەتی (ورش عن نافع ).

هەروەها لەگەڵ تۆمارکردنی خەتمی قورئان بە شێوەی تەجوید و تـیلاوە بـە ڕیوایـەتی (قـالون و الـدوری) لەگـەڵ (المـصحف المعلـم) کـە بـەگوێرەی وتـەی هەنـدێك کەسـی نزیکـی (شـێخ حوســـەری) تۆمـــارکردنی خەتمەکـــە ( ١٠ ) ســـاڵی ڕێکـــی خایانـدووە، تۆمـارکردنی ئـەم جـۆرە خەتمانـە لەسـەر داوای خودی خۆی بووە، پاش ئەوەی هەستی کرد کە تەبشیرییەکان لەئە فریقیـا و وڵاتـانی ئاسـیا لـە جووڵـەدان بـۆ بڵاوکردنـەوەی ئـایینی مەسـیحیەت، وەزارەتـی ئـەوقافی میـسریش پـشتگیری کرد و بەشێوەی کاسێت و قەوان لە وڵاتـانی ئـەفریقیا و ئاسـیا

بڵاوی کردەوەو زۆربەی سەرۆك و پاشای وڵاتانی ئیسلامی پێشوازی گەرمیان لەو هەنگاوە مەزنە کردو خەڵاتیان کرد و نازناوی یەکەم قورئان خوێنیان بۆ ساڵی ١٩٦٧ پێ بەخشی.

(محمود حصری) لە ساڵی ١٩٣٨ی زاینی خێزانی پێکهێناو سەرجەم منداڵەکانی بە خێزانەکەیشیەوە بە هەوڵی شێخ مەحمود قورئانیان لەبەرکرد، یەکێك لە کورەکانی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لەساڵی ١٩٦٠ هەموو رۆژێك کۆی دەکردینەوە و قورئانی فێردەکردین، بۆ لەبەرکردنی هەر جوزئێك لە قورئان بڕی دە قرشی پێ دەداین، هەروەها دەڵێ باوکێکی دەم بەخەندە و نەرم ونیان و ئارامگر و خێرخواز و متەوازیع بوو، زۆر بە جوانی پەروەردەی دەکردین..

## **ئەو خواردنانەی شێخ (مەحمود) حەزی لێبووە چی بوون؟**

شێخ زۆر حەزی لە خواردنی کاڵەك کردووە، بە بەردەوامی دەیخوارد لەگەڵ نانی دەستکردی ماڵەوە لەگەڵ پارچە پەنیری سپی..

گەورەترین بەخشش کە پێی بەخشرا هەڵبژاردنی بوو بە سەرۆکی یەکێتی قورئانخوێنانی جیهانی ئیسلامیی لە ساڵی ١٩٦٨ کە لەو ساڵەدا یەکەم کەس بووە لە کۆنگرێسی ئەمریکی

و ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆشکی سپی ئەمریکی قورئانی پیرۆز بۆ ئامادەبووان بخوێنێت.

وەنەبێ خوالێخۆشبوو بە تەنها هەر قورئان خوێن بووبێ، بەڵکو نووسەرێکی کارامە بووە و چەندین کتێبی داناوە لەسەر چۆنیەتی فێربوونی قورئان..

## چۆنیەتی نەخۆش کەوتنی و کۆچکردنی؟

لە ساڵی ١٩٨٠ بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی کە نەخۆشی دڵ بوو گەیەنرایە وڵاتی سعودیە، پاش چەند هەفتەیەك لە چارەسەری گەڕایەوە میسر، بەڵام دوای سێ ڕۆژ لە گەڕانەوەی نەخۆشیەکەی توندتر بوو و لەسەر بەرماڵەکەی گیانە بەرزەکەی لە شەقەی باڵی دا، کە لە بەرواری ٢٤/١١/ ١٩٨٠ی زاییندا بوو، پاش ئەوەی نوێژی (عیشا) ی ئەنجامدا ڕاستەوخۆ دوای تەواوکردنی نوێژەکەی گیانی سپارد..

بەڕاستی کەسێك نییە وەکو ئەوو لەدوای ئەو، بتوانێ هەوڵ و کۆشش بدات بتوانێ شەش جۆر خەتمی قورئانی پیرۆز تۆمار بکات بۆ ئایندە، کە ئەمڕۆکە بە هەزاران کەس بەهۆی کاسێتە دەنگیەکانی ئەو کەڵە قورئان خوێنە توانیویانە فێری قورئانی

پیرۆز بن..هەزاران ڕەحمەت لە گیانی بەرزو پاکی بێت و جێگەی بەهەشتی بەرین و نەبڕاوە بێت ....

لەژیانیدا ئەم بەرهەمانەی بەچاپ گەیاندووە:

- أحكام قراءة القرآن الكريم ، و هو هذا الكتاب
- القراءات العشر من الشاطبية و الدرة
- معالم الإهتداء إلى معرفة الوقف و الإبتداء
- الفتح الكبير في الإستعاذة و التكبير
- أحسن الأثر في تاريخ القراء الأربعة عشر
- مع القرآن الكريم
- قراءة ورش عن نافع المدني
- قراءة الدوري عن أبي عمرو البصري
- نور القلوب في قراءة الإمام يعقوب
- السبيل الميسر في قراءة الإمام أبي جعفر
- حسن المسرة في الجمع بين الشاطبية و الدرة
- المنهج الجديد في علم التجويد

رحلاتي في الإسلام . و له مقالات عديدة في مجلة لواء الإسلام.



مەحمود خەلیل ئەلحوسەری و محەممەد سدیق

ئەلمەنشاوی لەبەغدای پایتەختی عێراق ١٩٦٥ ی زایینی



﴿ محمد صديق المنشاوي ﴾

دەبێ کەسێك هەبێ ئەم کەڵە قورئانخوێنـە نەناسـێ.. ئەمـەیان خاوەنی قوتابخانەیەکی گەورەو فراوانەو بە سـەدان و هـەزاران قوتـابی لـە خۆگرتـووە، خـاوەنی دەنگێکـە کـە ڕاسـتەوخۆ دەچـێتە قـوڵایی دڵـەوەو مێـشك زاخـاو دەدات... گـەر بتـەوێ کەمێك گوێی لێ بگریت ئەوا دڵەکەت زیاتر هانت دەدات تاوەکو زیاتر و زێتر و بەخوشوعتر گوێی بۆ ڕادێری!

مێژووی ژیانی پڕن لە حیکمەت... پـڕن لـە بەسـەرهات... پـڕن لە ئەشك و گریان، چونکە تەمەنە کورتەکەی بواری نەدا زیـاتر خزمـەت بکـات، بـەڵکو ئەرشـیفە پـڕ نـەمر و گرانبەهاکـەی وایکـردووە هـەزاران قوتـابی لـە دەوری قورئـانی پـیرۆز کۆبکاتـەوە.. چـەندەی باسـی بکـەم کەمـەو ناکاتـە وەفایـەك بەرامبەر بەم قورئانخوێنە مەزن و بلیمەتە.

هەموو قورئانخوێنێك گەواهیدەری ئەوەن كە چۆن پیاوێكی زاهید بووە و دوور بووە لە خۆدەرخستن و خوێندنی قورئان بەرامبەربە پارە یاخود بەرامبەر بە كۆكردنەوەی ماڵ و سامان، یا هەرشتێكی تری دنیایی ... هەروەها ڕۆژێك لە ڕۆژان ملكەچی هیچ پاشا و سەرۆكێك نەبووە و گەوهەرێك بووە بۆ سەردەمەكەی و سەردەمی ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامیی، ئەم قورئان خوێنە كوڕی (صدیق المنشاوی) قورئانخوێنە و لەساڵی ١٩٢٠ ی زایینی لە پارێزگای (سوهاج) لە دایك بووە..

تا بڵێی زیرەك و زیتەڵ بووە، بۆیە باوكی لە تەمەنی چوار ساڵان ناردوویەتی بۆ لای (شێخ أبو مسلم).. ناوبراو شێخ (محمد صدیق المنشاوی) زۆر خۆش ویستووە و لە بارەیەوە وتوویەتی (ئەم منداڵە بەرەكەتدارە و خێری بەدوواوەیە).

سەیر لەوەدابوو موحەممەدی بچكۆلانە، لە تەمەنی هەشت ساڵان توانی هەموو قورئانی پیرۆز لەبەر بكات كە ئەمەیان بووە مایەی خۆشحاڵی باوكی..! بەڵێ لەم كاتەدا (شێخ أحمد السید) ی مامی دەستی دەگرێ و لەگەڵ خۆی بەرەو قاهیرەی پایتەختی دەبات و چوار ساڵ لەو شارە دەمێنێتەوە و لای

مامی و (شێخ موحەممەد مەسعود) فێری زانستەکانی قورئان و چۆنیەتی خوێندنی قورئان و ئەحکامەکانی تەجوید دەبێت.

لــە تەمــەنی دوازدە ســاڵان مــامی لەگــەڵ خــۆی دەیباتــە ئاهەنگەکانی قورئان خوێندن و بەشداری پێدەکات.. تاوەکو لە تەمەنی پازدە ساڵان بە تەواوەتی ناوبانگی دەرکرد.

یەکەم کەس بووە کە لە ساڵی ١٩٥٣ ئێزگەی قاهیرە داوای لـێ کردبێ سەردانی ئێزگە بکات بۆ قورئـان خوێنـدن، بـەڵام ئایـا خوالێخۆشبوو بەمە ڕازی بوو؟

لەسەرەتادا (محمد صدیق المنشاوی) بـەهیچ شـێوەیەك ڕازی نـەدەبووگوێ بـەداخوازی ئێزگەکـە بـدات، هـەروەها گـوێی بـۆ داواکارییەکانی بەرپرسانی ئێزگە کـەچ نـەدەکرد و، دەیگـوت : من پێویستیم بە ناوبانگێتی و ناودارێتی نییەو من تـەنها لەبـەر ڕەزامەنـدی خـودا و پـیرۆزی ئـەم قورئانــە دەخـوێنم و وازم لێبێــنن.. ئــەوەبوو ئێزگــەی ئــەوکاتی میــسر ئەنــدازیارە دەنگییـەکانی دەنـاردە ئاهەنگـەکان و دەنگـی (محمد صدیق) یان تۆمار دەکرد و لە ئێزگە پەخشیان دەکرد!!

سێ جـار بـە بـەردەوامی بەڕێوەبـەری ئێزگـە سـەردانی (محمد صدیق المنـشاوی) کـرد و داوای لـێ کـرد سـەردانی ئێزگـە بکـا

کەهەر لە ساڵی ١٩٥٣ دا بوو.. ئەویش ڕەتی دەکردەوەو تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی گەورە ئەفسەرێك بە ناوی (عبدالفتاح الباشا) بە ڕوتبەی لیوای ڕوکن دەخاڵەت لە مشت و مڕی نێوان سەرۆکی ئێزگەی قاهیرە و خوالێخۆشبوو بکات و سەردانی ماڵی مەنشاوی کردو گوتی: ئەی محەممەد .. پێویست بە ماندووبوون ناکات، تاوەکو هەواڵی ناڕازی بوونی تۆ نەگەیشتۆتە دەسەڵاتدارانی دەوڵەت وا چاکە سەردانی ئێزگە بکەیت.. بەهۆی زۆر لێکردنی ئەو ئەفسەرە کە خزمی نزیکی (مەنشاوی) بوو خوالێخۆشبووش ڕەزامەندی خۆی نیشانداو سەردانی ئێزگەی کرد، تا وادەی لە دنیا دەرچوونی بە بەردەوامی هاتوچۆی ئێزگەی دەکرد..

## ئەو پیلانانەی کە لە دژی ئە نجامدراون..

زۆربەی قورئانخوێنەکان ئەو پیلانانەیان لە بارەی خوالێخۆشبوو گێڕاوەتەوە کە لەلایەن کەسێکەوە ئەنجامدرا کە خۆیشی قورئانخوێن بووە، بەر لە ساڵی ١٩٦٠ بوو پیلان دانەرەکە بە هەزاران کەسی بانگهێشتی ئاهەنگێك کرد و (محمد صدیق المنشاوی)ش، لە هەمان ئاهەنگ داوەتکرا، بەر لە هاتنی ( شێخ مەنشاوی ) پلاندانەرەکە گوتی: شێخ مەنشاوی

بەبێ (مـایکرۆفۆن) دەنگـی لاوازە و هیـچی بـۆ نـاکرێ و تـاقیی دەکەینەوە ! ! کە مەنـشاوی گەیـشتە ئاهەنگەکـە و لەبەرامبـەر مــایکرۆفۆن دانیــشت لەوکاتــەدا نزیکــەی دە هــەزار کــەس ئامادەببوون بۆ گوێ گرتن لە خوالێخۆشبوو.. ! !

مەنـشاوی ویـستی بخـوێنێ ئەنـدازیاری دەنـگ گـوتی: ئـامێری دەنگ لەکار وەستاوە و دەنگی لێوە دەرناچێت ! !

مەنشاویش زانی کە پیلانێك لە دژی دارێژراوە بەبێ ئەوەی تێك بـچێ و بـێ سـێ و دوو، هەڵـسایە سـەرپێ و دەسـتی کـرد بـە قورئــان خوێنــدن و بــەناو ئامــادەبووان گــوزەری دەکــرد و دەرۆیشت و دەگەڕایەوە دواوە..

تــا وای لێهــات هــەموو ئامــادەبووان لەگــەڵ دەنگــە بــەهێز و بەپێزەکــەی ئــەو دەیاندایــە هــاوارو (الله أکـبر) کـردن ! ! لـەو کاتەداپیلاندانەرەکــە هیــچی بــۆ نەمایــەوەو بــە ڕیــسوایی ئاهەنگەکەی بـەجێ هێـشت ..منداڵـەکانی مەنـشاویش چـەندین جـار داوایـان لـە باوکیـان دەکـرد کـە نـاوی قورئـان خوێنـە پیلاندانەرەکەیان پێ بڵێ ئەویش دەیگوت: وازبێنن و بۆ خـوای لێگەڕێن..

## پیلانێکی تر بۆ لەناوبردنی مەنشاوی!!!

خوالێخۆشبوو گێڕایەوە کە لە ساڵی ١٩٦٣ی زایینی بانگهێشتی ئاهەنگێکی قورئانخوێندن کرام.. پاش ئاهەنگەکە سەرپەرشتیاری ئاهەنگەکە گوتی: ئەمشەو تۆ میوانی ئێمەی و دەبێ لەگەڵ ئێمە ژەمی ئەم ئێوارە بخۆیت.. منیش ڕەتی داواکەم کردەوەو گوتم: پێویست بەو ئەزیەتە ناکات و دەچمەوە ماڵی خۆم..

پاش کەمێك خاوەن ئاهەنگ بەرەو خوانی ئێوارە چوو و هەندێك کەسی تری بانگ کرد، لەوکاتەدا چێشت لێنەرەکە بەرەو ڕووم هات و بە دڵەڕاوکێ و ڕەنگی شێواوەوە پێی گوتم: مامۆستاگیان، شتێك هەیە دەمەوێ پێتی ڕابگەیەنم، بەڵام حەزناکەم ئەوان بزانن کە من ئەم هەواڵەم بەتۆ داوە... چونکە من هەژراو کەمدەراتم و چەندین ساڵە لێرە چێشت لێنەرم و ئەگەر بزانن نان بڕاوم دەکەن!!

مامۆستا، باش بزانە سەرپەرشتیاری ئاهەنگەکە (ژەهر)ی لە خواردن کردووە کە لە بەشێکی خواردنەکەی تۆی داناوە .. تکات لێ دەکەم نزیك خواردنەکە مەکەوە شتێکیش هەیە

دەمەوێ پێتی بڵێم کە من ژەهرم لە خواردنەکەی تۆ کردووە بەرامبەر بە بڕێك پارە کە سەرپەرشتیاری ئاهەنگەکە زۆری لێ کردم ئەم کارە ئەنجام بدەم کە ئەویش کودەتایەکە دژ بە تۆ!!

کە خواردنەکە هاتە بەردەم شێخ مەنشاوی ئەو خەسڵەتانەی خواردنەکە کە چێشت لێنەرەکە بۆی باسکردبوو ناسییەوە...!!! بەڵام دەستی بۆ درێژ نەکردو ئەو تەنها پارچە نانێکی هەڵگرت و بەسەرپەرشتیارانی ئاهەنگەکەی گوت: ئەمە بەسە بۆمن و خۆتان چێشتەکە بخۆن!!

پاشان ڕۆیشتم و ماڵئاواییم لە کەسیان نەکرد.

خوالێخۆشبوو لە هیچ پەیمانگایەکی مۆسیقی نەیخوێندووە، بەڵام هەموو مۆسیقاژەن و ئاوازدانەرەکانی سەردەمی خۆی سەرسام کردبوو چونکە دەنگێکی لەرادەبەدەر خۆش و مۆسیقیی هەبووە سەرەڕای بوونی شارەزاییەکی تەواو لە سەرجەم جۆرەکانی مەقامات.. خودی خۆیشی زۆربەی جاران گوێی لە مۆسیقا و تەواشیح دەگرت..

## ئایا ( محمد صدیق المنشاوی ) پەیوەندی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی میسر چۆن بووە؟

مەنشاوی بە هیچ شێوەیەك سەردانی هیچ پاشا و سەرۆکێکی نەکردووە و بەدەم داوەتەکانیان نەچووە. بۆ نموونە : چەندین جار لەلایەن شا فاروق داوای لێکراوە سەردانی کۆشکی پاشایەتی بکات و قورئان بخوێنێت، بەڵام ئەو ڕەتی دەکردەوەو دەیگوت : چۆن دەبێ لە سووچێکی کۆشك قورئان بخوێنرێ و لە سووچێکی دیکەش خراپەکاری ئەنجام بدرێ؟!! هەروەها لەسەرەتای شەستەکان (جەمال عەبدولناسـر) ی، سەرۆکی میسر داوەتنامەیەك لەرێگەی وەزیرێکیەوە ئاراستەی مەنشاوی دەکات.. وەزیرەکە بە مەنشاوی دەڵێ: شەرەفێکی گەورەت دەست دەکەوێ ئەگەر بێت و ئامادەی ئەم ئاهەنگە بیت کە تێیدا سەرۆك (جەمال عەبدولناسر) ئامادە دەبێت.. (مەنشاوی)ش، بەبێ ئەوەی بترسێت بوێرانە ڕوو لە وەزیرەکە دەکات و ئەڵێ: ئەی بۆ ئەو شەرەفە گەورەیە بەر سەرۆکەکەت نەکەوێ کە تێیدا گوێ لە قورئانی پیرۆز بگرێت بە دەنگی (محمد صديق المنشاوي)!!!

مەنشاوی ڕەتی داواکەی کردووەو گوتی: جەمال عەبدولناسر (هەڵەی کرد!!!) لەکاتێکدا کە خراپترین وەزیری ناردۆتە لای من!!!

## بەسەرهاتێکی خۆش لە ژیانی مەنشاویدا

هەرچەندە (محمد صدیق المنشاوی) لە نێو خەڵکی ناوبانگێکی لەڕادەبەدەر گەورەی دەرکردبوو، بەڵام زۆر بێ فیزبوو هەروەها ڕۆژێك لەڕۆژان ڕووپامایی ڕووی تێنەکردووە و بە بەردەوامی بەرامبەر بە باڵەخانەی بەرامبەر ماڵەکەیان بەدەم قورئان خوێندنەوە دادەنیشت و هەموو کاتێك دشداشەیەك و مەندیلێکی سپی و کلاوێکی سووری لەسەر بووەو ڕەنگ و ڕووخساری گەنمی هەبوو... زۆربەری خەڵکی وایان هەست دەکرد کە ئەم پیاوە دەرگەوان و پاسەوانی باڵەخانەکەیە..

ڕۆژێکیان کەمەنشاوی بەجلێکی ئاسایی و بەبێ چاویلکەو مەندیلەکەی سەرییەوە لەنزیك باڵەخانەکە دانیشتووە، کەسێکی مەسیحی لێی دێتە پێشەوەو سڵاوی لێ دەکات و دەڵێ: ئەرێ مامەگیان بە دوای کەسێك دەگەڕێم ناوی (محمد صدیق المنشاوی)ە، ئایا نایناسیت؟ چونکە لە شارێکی ترەوە هاتووم و، ناوبانگم بیستووە و گوێم لە دەنگی بووە... کە خاوەن دەنگێکی زۆر خۆشەو هاتووم بیناسم بزانم چۆنە؟..

لەوکاتەدا (مەنشاوی) هیچ بەسەر خۆی ناهێنێ و دەڵێ: (باشە

کوڕی خۆم چاوەڕێ بکە ئەوەی بەرامبەرمانماڵەکەیەتی ڕێگەم بدە تابۆت بانگ بکەم ) .

(مەنشاوی) دەچێتە ژوورەوە و چاویلکەکەی لەچاو دەکات و دێتە لای مەسیحیەکە و دەڵێ من مەنشاویم و فەرموو لە خزمەتدام، پاشان مەسیحییەکە سەری سوڕ دەمێنێ و دەڵێ تۆ هەرئەو کەسە نیت کە ئێستاکە لێرە دانیشتبوویت و پرسیارم ئاڕاستە کردی! ! ؟ مەنشاوی دەڵێ من بووم.. بەڵام حەزم نەکرد یەکسەر خۆمت پێ بناسێنم و پاشان مەسیحییەکە لەبەردەم باڵەخانەکە بە کۆمەڵێك پرسیار تا درەنگانێك لەگەڵیی دادەنیشێت.

(محمد صديق المنشاوى) بە بەردەوامی لەگەڵ هەژاران هەڵس و کەوتی دەکرد و لە زۆربەی ژەمی ئێواران و نیوەڕۆیان داوەتی دەکردن..

زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی دەیانوت مەنشاوی بەرپرسان داوەتی نانخواردن دەکات، بەڵام کە دەچوونە ماڵەکەی دەیانبینی داوەتکراوەکان سەرجەمیان هەژارو نەدارن! !

## چۆنیەتی نەخۆش کەوتنی:

لە تەمەنی زوودا نەخۆشییێکی کتوپڕ ڕووی لە قورئانخوێن کرد . لەساڵی ۱۹٦۲ چەندین جار سەردانی پزیشکێکی موسڵمانی هیندی کرد و بەبەردەوامی هۆشداری دەدایە مەنشاوی کە لەسەرەخۆ و بەدەنگی نرم قورئان بخوێنێت، نەخۆشیەکەی درێژەی خایاند کە نەخۆشی (سنگ و گەروو) بوو، تاوەکو لە ساڵی ۱۹٦٦ ی زاینی زۆری بۆهێنا کە ئەوکاتە تەمەنی چل و شەش ساڵان بوو..

پزیشکەکان توانیان لە ڕێگەی هەندێك چارەسەری و دەرمانەوە کەمێك لە نەخۆشیەکەی کەم بکەن و ئامۆژگارییان دەکرد لەکاتی قورئان خوێندن دەنگی بەرز نەکاتەوە و بە هێمنی بخوێنێت، بەڵام ئەو ئامۆژگارییەکانی بە دڵ نەبوون تاوەکو لە دنیا دەرچوونی بە هەموو هێزێکی و بە قورگێکی پڕ و پاراو قورئانی دەخوێند بۆنموونە ئەگەر ئەو ماڵانەی زۆر لە مزگەوت دووربوون بە ئاسانی گوێیان لێ دەبوو کە دەنگی گەلێك بەهێز بوو..

(جەمال عبدالناسر) بە نەخۆشییەکەی زانی بڕیاریدا لەسەر نەفەقەی دەوڵەت ڕەوانەی لەندەنی پایتەختی بەریتانیا

بکرێت.. بەڵام جارێکی تر مەنشاوی ڕەتی بڕیارەکانی ناوبراوی کردەوەو گوتی: بە ئەجەلێك ڕازیم کە لەلایەن خوداوە بۆم نووسرابێت، لەبەرواری ۱۹٦۹/٦/۲۰ی زایینی و لە تەمەنی (٤۹) ساڵان ماڵئاوایی لە جیهانی ئیسلامیی کردو چاوەکانی لێکنا.

## ئایا مەنشاوی بەر لە مردنی بە خەتەرناکی نەخۆشییەکەی دەزانی؟

بێگومان هەستی بە نەخۆشییەکەی دەکرد.. مانگێك بەر لە دنیا دەرچوونی وەك هەموو جارێکی پێشوو سەردانی بازاڕی دەکرد و لەلایَ هاوڕێکای دادەنیشت، هەرجارەی دانیشتبایە منداڵێك دەهات پێڵاوەکانی دەبرد و بۆیەی دەکرد، ئەوهەموو جارێك پارەی بە منداڵەکە دەدا.. بەڵام کە دواجار پێڵاوەکەی برد ( شێخ محمەد مەنشاوی ) پێی گوت: ڕۆڵەگیان پێڵاوەکانم بۆیەکەو ئەمجارەیان دوایین جار دەبێ و پارەکەش لە (سعود)ی کوڕم وەربگرە، منداڵەکەش گوتی: لەبەرچی مامۆستاگیان؟

گوتی: ئەمجارەیان دوایین جارە دەمبینی کوڕەکەم سوپاست دەکەم!!!

هەزاران و ملیۆنان خەڵك لەڕێگەی کاسێتە دەنگییەکانی ئەو کەڵە قورئان خوێنە فێری قورئانخوێندن و تەجوید بوون، بێگومان لەسەرهەمووومان پێویستە بە بەردەوامی نزای خێری بۆ بکەین.. بۆ نموونە زۆربەمان گوێبیستی سورەتی (الاحزاب ، العلق ، الانفال ، ق) بووین کە چەندە بە ئاوازێکی جوان و دەنگێکی گڕو پڕ لە حەماسەت دەخوێنێ، بەتایبەتی لەسورەتی (یوسف) کەلەساڵی ١٩٦٠ لەمزگەوتی ( لالا پاشا) ی شاری دیمەشق خوێندوویەتی کە دەنگێکی ئێجگار خۆشی هەیە ، یاخود لەسورەتی( العلق) ئایەتی ﴿ كلا ان الانسان ليطغى . أن رءآه آستغنى .. إن الى ربك الرجعى ﴾ کە ئەم سورەتەی لە کۆتایی ڕۆژەکانی تەمەنی خوێندوویەتی..مەنشاوی ڕەحمەتیی لە هیچ کات و ساتێك پارەی وەرنەگرتووە، بۆ نموونە بەر لە ماڵئاواییکردنی بەشداری لە پرسەیەك دەکات و دوای تەواو بوونی پرسەکە یەکێك لەسەرپەرشتیارانی پرسەکە بڕێك پارە لە گیرفانی دەردەهێنێ و دەڵێ: مامۆستا ئەمە بەرامبەر قورئانخوێندنەکەتە !

مەنشاویش ڕەنگ و ڕووخساری سوور هەڵدەگەڕێ و زۆر تووڕە دەبێ و پێی دەڵێ: ئایەتەکانی خودا بۆ کۆکردنەوەی پارە و بازرگانی پێکردن دانەبەزیون. بەبێ ئەوەی خواحافیزی لە سەرپەرشتیاری پرسەکە بکات دەگەڕێتەوە ماڵەوە، پاشان بۆ بەیانی سەرپەرشتیاری پرسەکە دەچێتە ماڵی مەنشاوی و زۆر داوای لێبووردن لە مەنشاوی دەکات ! !

## باوکی چۆن پێشوازی لە مردنی کورەکەی کرد؟

هیچ خەفەتبار نەبوو و دلگرانی ڕووی تێنەکرد تەنهاگوتی: (انا لله وانا اليه راجعون). (محمد صديق المنشاوى ) لەدوای خۆی ئەرشیفێکی گەورەو دەوڵەمەندی بەجێ هێشت کە سوپاس بۆ خوای گەورە ئەمڕۆ لەسەرانسەری جیهانی ئیسلامیدا بەبەرزو نەمری ماوەتەوەو بە ملیۆنان خەڵك بەهۆیەوە فێری خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بوون. لە ماوەی ژیانیدا سێ جۆر خەتمی تۆمارکردووە، دوانیان بەشێوەی تەرتیل و سێهەمیان بە شێوەی تیلاوە، هەروەها لەگەڵ چل و نۆ کاسێتی تۆمارکراوی نێو مزگەوت و ئاهەنگەکان کە لە ڕۆژانی هەینی لە مزگەوتەکانی (لالا پاشا) لە سوریا و مزگەوتی (ألحسين) لە قاهیرە لەگەڵ هەندێك کاسێتی تۆمارکراوی چەند ئاهەنگێکی

قورئان خوێندن لە شەوانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز لە سالانی ١٩٥٦ تاوەکو ١٩٦٧ ی زایینی لەمەغریب و کوێت و ئەندنوسیاو سوریاو لیبیا وعێراق بۆی تۆمارکراوە.

## ئایا لە ژیانیدا سەردانی هیچ ولاتێکی کردووە؟

لە ناوەڕاستی پەنجاکان بەهاوڕێیەتی قورئان خوێنی بەناوبانگ (عبدالباسط محمد عبدالصمد) سەردانی ولاتی ئەندەنوسیای کرد.. لە کاتی گەیشتنیان بۆ ئەندەنوسیا خودی (ئەحمەد سۆکارنۆ) ی، سەرۆکی ئەو ولاتە هاتە پێشوازییان و لە ئاهەنگێکی گەورەدا کە پێنج سەد هەزار کەس تێیدا ئامادەبوون، سەرەتا (سۆکارنۆ) وتارێکی پێشکەش کردو گوتی: ئەمڕۆ ولاتی ئەندەنوسیا و گەلەکەی پێشوازی لە دوو میوانی گەورەو مەزن دەکەن، کە بێگومان گەلی ئەندەنوسی لە مێژوویدا پێشوازی لە هیچ کەسایەتیەکی وەکو (مەنشاوی و عەبدولباست) نەکردووە.. پاشان مەنشاوی بە کوڵ گریا ئنجا دەستی بە قورئان خوێندن کرد، بەلام چ خوێندنێك کە لە میانەیدا سەرۆکی ئەندەنوسیا و هەموو ئامادەبووانی بە کوڵ هێنایە گریان، هەروەها لە ساڵی ١٩٦٥ سەردانی ولاتانی

(عێـراق و سـوريا و ليبيـا و جـەزائير و كوێـت و سـعوديە)ی كـردووە.. بـۆدوايين جـاريش بەرلـەوەی گيانەكـەی بگەڕێتـەوە بـۆلای خـوای گـەورە لەسـاڵی ١٩٦٧ سـەردانی عێراقـی كـردو، بۆمـاوەی دەشـەو لەناوچـەی ئەعزەميـەی بەغـدای پايتـەخت مايەوە وبەشدای لەچەند ئاهەنگێكی شـەوانەی قورئـانی پـيرۆز كـرد، شـەوێكيان گـەورەی قورئانخوێنـانی عێـراق شـێخ حـافز خەليل ئيسماعيل بەتەنيشت مەنـشاويەوە دادەنيشێت و شـێخ حافز خـەليل زۆر بەهەشـتيارييەوە گـوێی بۆدەگرێـت و سـەری سـوڕدەمێنێت لەودەنگـە بـەهێزە و شـارەزاييە تـەواوەی لەمـەقامات و پاشـان بەگوێيـدا دەچـرپێنێت و پێـی دەڵـێ: مامۆسـتا گيـان تـۆزۆر ئايەتـەكان دووبارەدەكەيتـەوە، پاشـان پێـی دەڵێـت: ئـەی بۆچـی وەكـو ئێمـە و بەمـەقاماتی عێراقـی ناخوێنيت ؟؟ مەنشاويش پێی دەڵێت: ئينـشائەڵلا لـەداهاتوودا هەوڵی بۆدەدەم، ئەوشـەوە زۆرسـورەت لەسـورەتەپيرۆزەكانی قورئانی پيرۆز دەخوێنێت، دەگاتە ئەورادەيەی خوێن لـەقوڕگی دێتە خوارەوە كەئەويش بەهۆی ئەو نەخۆشـيە بـوو كەلەسـاڵی ١٩٦٢ دووچاری ببۆوە .

**کورتەیەك لە ژیانی:**

لەساڵی ١٩٣٨ خێزانی یەکەمی پێکهێناوە کە ئامۆزای خۆی بووە و خوای گەورە دوو کوڕو دوو کچی پێ بەخشی.

لە ساڵی ١٩٦١ ژنی دووەمی هێناوە کە لە هاوسەری دووەمی نۆ منداڵی هەبووە پێنج کوڕ و چوار کچ.

بە هۆی سۆزو خۆشەویستی ڕێزی نێوانیان خودای گەورە لە یەك خانوو کۆی کردبوونەوە وهیچ ڕۆژێك دووچاری شەڕ و دەمەقاڵێ نەهاتوون، وەکو هەردەم مەنشاوی دەیگوت (چۆن خەڵك ڕێزم دەگرن، ئێوەش ڕێزی یەکتر بگرن).

بۆیەکەمجار لە ساڵی١٩٥٥ی زایینی ئۆتۆمبێلی کڕیوە، کە تەنها بۆ کاتی گەشتکردن بەکاری دەهێنا.

بەرلەوەی بگاتە هەشت ساڵان واتە لە ساڵی ١٩٢٨ هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە.

لە ژیانیدا زۆر بە قورئانخوێن (محمد رفعت) سەرسام بووە و بە بەردەوامی پەیوەندی پتەوی لەگەڵدا هەبووە..

یەکەم کەس بووە ئێزگە سەردانی بکات.

لەدوای خۆی کوڕێکی بەناوی (صلاح)، کە پیشەی ژمێریارە شوێنی پڕکردۆتەوە، کە خاوەن دەنگێکی خۆشەو هەموو قورئانی لە بەرە، هەروەها بە هەمان شێوە (عومەر) ی کوڕی

سەرجەم سورەتەکانی قورئانی لەبەرەو مامۆستایە لە زانکۆی ئەزهەر.
لە ئەندەنوسیا لەلایەن سەرۆکی ئەو وڵاتەوە خەڵاتی یەکەمی پێ بەخشراوە.
لە سوریاش خەڵاتی دووەمی پێ بەخشراوە.
بە بەردەوامی حەزی لە وەرزش کردووە بەتایبەتی ڕاکردن و ڕۆیشتن بە پیادە.. هەزاران ڕەحمەتی خودا لە گۆڕەکەی بێت و جێگای بە هەشتی بەرین بێت ....



( محمد صديق المنشاوى ) لە یەکێك لە ئاهەنگەکانی خوێندنی قورئانی پیرۆز لە ساڵی ١٩٦٨ لە وڵاتی لیبیا

**شێخ عەبدولعەزیز بن ئەلباز دەڵێت:**

(گەردەتەوێت گوێت لە قورئان بێ و بزانیت چۆن دابەزیوە ئەوا تەنها گوێ لەدەنگی (محەممەد سدیق ئەلمەنشاوی) بگرە ،چونکە دەنگێك نییە هاوتای دەنگی ئەو بێت !!دەنگی مەنشاوی وەکو ئاوێکی پاك و سازگارە کە تینوێتی دەشکێنێ ) ...





## ﴿ عبدالباسط محمد عبدالصمد ﴾

ئایا کێ هەیە لە ئێمە ئەم قورئان خوێنە نەناسێ؟.. دەنگێکی بێ هەڵچوون و ناسک.. قوتابخانەیەکە چەندین قوتابی لەخۆگرتووە.لە ساڵی ١٩٢٧ ی زاینی لە شاری (أرمنت) ی سەر بە پارێزگای (قنا) لە دایك بووەو دوو برای گەورەی هەیە... یەکێکیان (محمود) کە پیشەی پشکنەر بووە لە قوتابخانە ناوەندییەکان و ئەوەی تریشیان (عبدالحمید) هەمان پیشەی هەبووە و سێهەمیان (عبدالله) ی برا بچووکی کە ئەندازیارە.. شێخ (عبدالباسط محمد عبدالصمد) لە تەمەنی حەوت ساڵان دەستی کردووە بە قورئان خوێندن و تەمەنی نەگەیشتۆتە دە ساڵان هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە، باوکی زانایەکی ناوداری ئایینی بووەو زۆر گرنگی بە (عبد الباسط) ی کوڕی سێهەمی داوە، چونکە لە منداڵییەوە خولیای قورئان خوێندنی هەبووە و دەنگێکی ناسك و زۆر خۆشی

هەبووە، پاشان باوکی بردوویەتیە پەیمانگای (أرمنت) و لەوێ لەلای شێخ (محمد سليم حمادە) فێری زانستەکانی قورئان و فێربوونی تەجوید بووە. لە تەمەنی منداڵییەوە باوکی لەگەڵ خۆی دەیبردە کۆڕو مەجلیسی قورئان خوێنان و بە بەردەوامی قورئانی پێ دەخوێند، تا وای لێ هات بەتەواوی دەنگی دایەوە، لە یەکەم ئاهەنگی قورئان خوێندندا (عبد الباسط) دە جوونەیهی پێدرا کە ئەوکاتە تەمەنی چواردە ساڵان بوو، واتە لە ساڵی ١٩٤١ ی زاینی.

لە ساڵی ١٩٥١ سەردانی قاهیرەی پایتەختی کردو داوەتی ئاهەنگێك کرا بەبۆنەی یادی لەدایك بوونی (زەینەب) ی کچی ئیمامی حوسێن خوا لێی رازی بێ.. لە ئاهەنگەکەدا ( شێخ عبدالفتاح الشعشاعی ) قورئانی دەخوێند و شێخ (عبد الباسط) یش بە تەنیشتیەوە دانیشت.. پاشان پیاوێك بە دەست ئیشارەی دایە (عبدالفتاح الشعشاعی) و گوتی ئەمەی تەنیشتت قورئانت خوێنەو دەنگێکی خۆشی هەیە. لەوکاتە (عبد الباسط) شەرم دایگرت و گوتی رووم نایە لە تەك قورئان خوێنێکی ئاوەها مەزندا قورئان بخوێنم!! پاش مشتو مڕێکی کەم (عبد الباسط) یان رازیکرد و گوتی تەنها دە خولەك

دەخوێنم.. دەستی بە خوێندن کرد، بەڵام چ خوێندنێك، دەنگێکی ناسك، سەرنج ڕاکێش، تەجویدێکی پوخت و ڕەوان.. ئامادەبووان سەریان سوڕما و داوایان کرد بەردەوام بێ و درێژە بە خوێندنەکەی بدات دە خولەکی تر خوێندی بەوە وازیان لێ نەهێنا تا وای لێ هات شێخ (عبد الباسط) تا درەنگانی شەو خوێندی و بە دەنگی ألله أکبر و لاإلە الا الله ئاهەنگەکە زیاتر دەوڵەمەندتربوو..

هەر لەو ساڵەش دوای چەندین داواکاری شێخ (ألضباع) شێخ (عبد الباسط) پەیوەندی بە ئێزگەی میسری کردو چەند کاسێتێکی دەنگی لەسەر قەوان تۆمارکرد.خوالێخۆشبوو لە تەمەنێکی زۆر زوودا خێزانی پێکهێنا و لە قاهیرەی پایتەخت گەڕایەوە شاری (أرمنت)، پاش چەند ساڵێك خێزان و منداڵەکانی لەگەڵ خۆی بردەوە قاهیرە و لە گەڕەکی (سیدە زینب) خانووێکی کڕی و، لەو ساڵە کەساڵی ١٩٥٢ بوو لە مزگەوتی ئیمام شافیعی دامەزرا، تاوەکو ساڵی ١٩٨١ ی زاینی ئینجا بۆ مزگەوتەکانی (الامام حسین و السیدە زینب و أبو العلا و الرفاعی)..

**ڕووداوێکی سەیر لە مێژووی ( عبد الباسط عبدالصمد )!!**

خـــۆی دەگێڕێتـــەوەدەڵێ : لـــە ســـاڵی ١٩٥٢ ی زاینـــی بـــە جلوبەرگی مەلایـەتی کـە جوببـەو مەنـدیلێکی سـپیە سـەردانی پاریسی پایتەختی فەرەنسام کـرد، بـە مەبەسـتی بـەرزڕاگرتنی شەوانی مانگی ڕەمەزانی پـیرۆز لـەو وڵاتـەدا.هـەروەها دەڵێـت: پاش ڕۆژوو شـکاندن حـەزم کـرد پیاسـەیەك بـەنێو بازاڕەکـانی (پـاریس) دا بکـەم، کـە گەیـشتمە سـەر شـەقام خـەڵکی بـە دیارمەوە وەستان و تەماشای جلوبەرگیان دەکـردم، سـەیریان پێم دەهات و دابوویانە قاقای پێکەنین! ! هەروەها منیش زۆرم شـــەرم کـــرد و لەگـــەڵ هـــاوەڵێکم ڕووم کـــردە بازاڕگەیـــەکی جلوبەرگ و جلەکانی خۆم داکەندو قات و پانتۆڵێکم کردە بـەر خۆم! کە یەکەمجار بـوو لـە ژیـانم تووشـی بەسـەرهاتێکی ئـاوا سەیرببم! !

**جگە لـە زمـانی عـەرەبی ( عبـد الباسـط ) هـیچ زمـانێکی تـری زانیوە؟**

لە ژیانیدا زۆر ئارەزووی دەکرد فێـری زمـانی ئینگلیـزی ببێـت، لێیـان پرسـی بۆچـی ئـارەزوو دەکـەی فێـری زمـانی ئینگلیـزی

ببیت؟ له وه‌لامدا گوتی : زۆر جار سه‌ردانی ولاتانی ئه‌وروپی ده‌که‌م، هه‌ندێك جار شه‌رم ده‌مگرێت که زمانی ئه‌وان نه‌زانم! بۆیه خوالێخۆشبوو په‌یوه‌ندی به په‌یمانگه‌یه‌ك کرد تاوه‌کو فێری زمانی ئینگلیزی ببێت، ماوه‌یه‌ك به‌رده‌وام بوو پاشان وازی لێ هێنا، ئه‌ویش له‌به‌ر زۆری گه‌شته‌کانی بۆ ده‌ره‌وه‌ی ولات و که‌مێك فێری زمانه‌که‌ببوو.

## ئه‌و قورئان خوێنانه کێن که (عبد الباسط) پێیان سه‌رسام بووه؟

دوو قورئان خوێن بوون یه‌که‌میان شێخ (محمد رفعت) دووهه‌میان شێخ (مسته‌فا اسماعیل) بووه، له باره‌ی (محمد رفعت)وه، ده‌یگوت: خاوه‌ن ده‌نگێکی به‌هێزو هه‌ناسه‌یه‌کی درێژه، بۆیه به به‌رده‌وامی گوێی لێ ده‌گرت و کاریگه‌ری به‌سه‌رییه‌وه هه‌بووه.

## ئه‌و خواردنانه چین که (عبد الباسط) حه‌زی لێ کردووه؟

خوالێخۆشبوو به هه‌موو خواردنێك ڕازیبووه و خواردوویه‌تی، به‌لام به‌تایبه‌تی زۆر حه‌زی له گۆشت بووه و له ژیانیدا چای نه‌خواردۆته‌وه، ته‌نها به‌ر له قورئان خوێندن فنجانه‌یه‌ك قاوه‌ی ده‌خوارده‌وه.. هه‌روه‌ها به هاوین و زستان ته‌نها ئاوی

(بەلوعە)ی دەخواردەوە، نزیکی ئاوێك نەدەکەوت کە سەهۆڵی تێدا بووایە یاخود ساردبایە.

## ئایا وەرزشوان بووە؟

بە بەردەوامی ئارەزووی لە وەرزش و مەلەکردن بووە، هەر بۆیە لە قاهیرە (ڤێلا) یەکی کڕی و مەلەوانگەیەکی بۆخۆی و منداڵەکانی دروستکرد و بە بەردەوامی و دوور لە چاوی خەڵکی مەلەی دەکرد..

لە بارەی خەوتنی : ڕۆژانەی خوالێخۆشبوو لە نیوەی شەوەوە دەچووە سەر جێگاکەی بە پچڕپچڕی دەخەوت و دوای نوێژی بەیانیش نەدەخەوتەوە، بە بەردەوامی قورئانی دەخوێند!! هەروەها لە ماوەی بیست و چوار کاتژمێردا تەنها نۆ کاتژمێری بۆ خەوتن تەرخان کردبوو..

ناوبراو لە ساڵی ١٩٥١ی زاینی سەردانی شانشینی عەرەبی سعودیە دەکات و، فەریزەی حەج بەجێ دەهێنێت و دوای تەواو کردنی مەناسیکەکانی حەج ڕووی لە ئێزگەی ئەو وڵاتە کردو خەتمێکی قورئانی بە ڕیوایەتی (حفص عن عاصم) تۆمارکرد.. پاشان وڵاتی سوریا داوەتێکی فەرمی بۆ نارد و داوای لێ کرد بۆ بەرز ڕاگرتنی مانگی ڕەمەزان بگاتە ئەو وڵاتە

و خوالێخۆشبووش داواکەی ڕەت نەکردەوەو سەردانی دیمەشقی کرد و لە مزگەوتی (الاموی) شەوانی ڕەمەزانی بەرزڕاگرت و یەکەم سورەت کە خوێندی سورەتی (التکویر) بوو کە لەسەرانسەری وڵاتانی ئیسلامیی دەنگی دایەوە، بە دەنگێکی ئێجگار خۆش و بە هەناسەیەکی درێژەوە سوورەتەکەی خوێند و تا ئێستاشی لەگەڵدابێ خەڵکان بەم جۆرە خوێندنەوەیە سەرسامن و هەر ئەو جۆرە خوێندنەوەش وایلێکرد کە زیاتر بەناوبانگ بێت، هەروەها سەردانی وڵاتانی لوبنان و جەزائیر و کوێت و باشووری ئەفریقیا و هیندستان و ئەندەنوسیاو دوورگەی مالدێڤ و سەنیگال و نایجیریا و بۆرما و پاکستان و ئیسپانیا و بەریتانیا و ئەمریکا و عێراقی کردووە، سەبارەت بە سەردانەکەی بۆ عێراق بەر لە کۆچی دوایی لە ساڵی ١٩٨٦ دابوو ( هەژاری موکریانی ) لە بابەتێکدا دەڵێ: (ئەوکاتە شێخ (عبد الباسط) لە هۆتێلی فەلەستین دەبێ و چاوپێکەوتنی لەگەڵ سازدەکەن، دەڵێ ( من بە ڕەچەڵەك کوردم و ڕەسەنایەتی باب و باپیریشم دەگەڕێتەوە بۆ شاری دیاربەکر ی کوردستانی تورکیا بەڵام لە کۆنەوە کۆچیان کردووە بۆ میسر )، قورئان خوێن لە ساڵی ١٩٦٧ سەردانی

بنکـەی ئیـسلامیی واشـنتۆن و سـەردانی چـوارده ویلایـەتی ئـەمریکی کـردووه و قورئـانی خوێنـدووەو لـە سـاڵی ١٩٧١ی زاینـیش چـۆته لەنـدەن بـۆ بەشـی عـەرەبی ڕادیـۆی BBCبـەریتانی چـەندین سـورەتی قورئـانی پـیرۆزی تۆماركردووه.

## چۆنیەتی نەخۆشكەوتنی و ماڵ ئاواییكردنی :

بە درێژایی ژیانی بە دەست ئازاری جگەرییەوە دەیناڵاند و ناوه ناوه ئازارێكی توندی دەگرت و بـە دەرمـان كـەمێك ئازارەكـەی دەوەسـتا.. مانگێـك بـەر لـە كۆچـی دواییكردنـی پزیـشكەكانی قاهیره پێیـان ڕاگەیانـد كـە پێویـستە بـچێتە دەرەوەی وڵات و چارەسـەریت لێـره دەسـت ناكـەوێت، خوالێخۆشـبووش بـەرەو لەنـدەنی پایتـەختی بـەریتانیا بەڕێكـەوت و دوای مانـەوەی لـە نەخۆشخانه بۆ ماوەی هەفتەیەك داوای لە (تاریق) ی كوڕەكەی كـرد بیگەڕێنێتـەوه میـسر، كـە گەڕایـەوه بـێ ئـەوەی بـچێتە نەخۆشـخانه ڕووی لـە ماڵـەوه كـرد و لەگـەڵ یەكـەم هـەنگاوی گـوتی (الحمـدلله) ئـەوا جـارێكی تـر بـە ماڵـەوه شـادبوومەوە». لەسـەر جێگاكـەی پـاڵ كـەوت و بـە كوڕەكـەی ڕاگەیانـد كـە تەرمەكەی بەرنه مزگەوتی (محمود) لـە گـەڕەكی (مهندسـین) و

لەویٚ نوێژی لەسەر بکەن، پرسەکەیشی لە مزگەوتی (حامدیە) ی نزیك یانەی زەمالك دابنریٚ.. مخابن دوای نیوەڕۆی ڕۆژی چوارشەممە بەرواری ١٩٨٨/١١/٣٠ لە تەمەنی شەست و یەك ساڵاندا گیانی لەدەستدا..

ئەو خەڵاتانەی پێی بەخشرابوو: خەڵاتی سەرۆکی سوریا (صبری العسلی) لە ساڵی ١٩٥٦... خەڵاتی سەرۆکی لوبنان لە هەمان ساڵ و خەڵاتی سەرۆکی مالیزیا(تنکو عبدالرحمن) لە کوالالامپوری پایتەخت لە ساڵی ١٩٥٦ کە پێنج سەد هەزار کەس ئامادەی ئاهەنگەکەبوون، دوو خەڵاتی حکومەتی میسریش لە ساڵەکانی ١٩٣٨ و ١٩٥٦.ئێستاش ( **طارق** ) کوڕە گەورەی شوێنی گرتۆتەوە.



## ﴿ محمود علی البنا ﴾

دەنگێـك زۆربــەی زانایــان لــە بارەیــەوە گوتوویانــە: خــاوەن دەنگێکی ڕەسەن.. ڕاڤەی وشەکان دەکات و ماناکـانی قورئـان بـە وێنــەوە نیـشان دەدات .. هەسـتی مـرۆڤ دەبـزوێنیو هــەق بێژە.. دەنگێکی پاراوو زمانێکی ڕەوانی هەیە..

لە سـاڵی ١٩٢٦ی زایینـی لـە گونـدی (شـبراباص) ی پارێزگـای (ألمنوفیە) لە خێزانێکی هەژارو ئـاین پـەروەر چـاوی بـە ژیـان هەڵهێناوە. باوکێکی ڕەنجدەرو جووتیـار. زۆر بـە گەشـبینیەوە دەیڕوانیە کوڕەکەی و بەر لـەوەی تەمـەنی بگاتـە پێـنج سـاڵان ناردوویەتیـە بـەر خوێنـدن و پاشـان زیـاتر هـەوڵی لەگەڵـداوە تاوەکو فێری قورئان خوێندن ببێت..

(مـەحمود) ی بـچکۆلانەش گوێڕایـەڵی بـاوکی بـووەو ئـاوات و خۆزگـەکانی بـەجێهێناوەو لـە تەمـەنی نـۆ سـاڵان توانیویـەتی

هـەموو قورئـانی پـیرۆز لەبـەر بکـات دواتـر بـاوکی بردوویەتیـە شاری (طنطا) و لەگەڵ خۆی بردویەتیە پەیمانگای ئایینی.. لـە سەرەتادا مامۆستاکانی پـەیمانگا ڕازی نـەبوون لـە پەیمانگاکـە وەربگیرێت، گوایە تەمەنی بچووکە، کە ئەوکاتە تەمەنی دوانـزە ساڵان بووە، پاشان کە زانیویانە زیتەڵ و بوێرە بە سوپاسـەوە وەریانگرتووە.

مامۆستاکانی ئامۆژگارییان کردووە بچێتە قاهیرە تاوەکو لـەوێ فێری زانستەکانی قورئان و چۆنیەتی خوێندنی قورئان ببێت.

(مـەحمود) ی قوتـابیش ئامۆژگـاری مامۆسـتاکانی بـە هەنـد وەرگرتووە و چۆتە شارەکە کە ئەوکاتـە سـاڵی ١٩٤٤ ی زاینـی بووە و تەمەنی لە سەرووی حەڤدە ساڵان بووە.. لەو شـارە لـە قورئانخوێنان (محمد سلامە و علی محمود و تەها فشنی) نزیـك بۆتەوە، ئینجا لای (درویش الحریری) بۆ فێربوون لە ئالەتەکانی مۆسـیقا و جۆرەکـانی مـەقاماتی عـەرەبی کـە لـە میانەیـدا کەڵکێکی زۆری وەرگرت.

## کێ یەکەم کەس بووە ( محمود عەلی البنا ) ی بەخەڵکی ناساند و هانیدا؟

لە ساڵی ١٩٤٧ کۆمەڵێك لە بەرپرسانی کۆمەڵەی گەنجانی موسڵمان (جمعیه شبان المسلمین) گوێیان لێ گرت و بە (ساڵح پاشا حەرب) ی سەرۆکی کۆمەڵەیان ناساند، خوالێخۆشبوو خۆی دەیگێڕێتەوە کە ساڵح پاشا یەکەم کەس بووە هانی دام و لە ساڵی ١٩٤٨ منی بردە ئێزگەی قاهیرە بۆ تۆمارکردنی قورئانی پیرۆز، کە ئەوکاتە تەمەنم بیستو دوو ساڵان بووەو بچووکترین قورئانخوێن بوویمە کە ڕوو لە ئێزگە بکەم و یەکەم سورەتیش کە خوێندم سورەتی (یونس) بوو.. کە لە تۆمارکردنیش بوومەوە ئەندازیارانی دەنگ ولێژنەی تاقیکردنەوەی دەنگ زۆر هانیاندام و ڕێزیان لێ گرتم..

هەروەها دەڵێ: کە لە ئێزگە ناوبانگم دەرکرد مانگانە بڕی شەش جونەیهم وەك مووچە بۆ بڕایەوە و زۆربەی قورئانخوێنەکان نارەزایەتیان دەربڕی و دەیانگوت وا چاکە ئێمە (مان بگرین) تاوەکو مووچەمان وەکو (مەحمود) لێ بێت لەکاتێکدا بەناوبانگترین قورئان خوێن چوار جونەیهی بەشێوەی مانگانە پێ دەدرا!!

شێخ مەحمود دەڵێ: دایکم تا ئەوکاتەی لە ژیاندا مابوو پێی دەگوتم رۆڵەکەم خۆزگە دەخوازم بتبینم ببیتە خزمەتکاری مزگەوتی گوندەکەمان، بەداخەوە دایکم لە تەمەنێکی کورتدا کۆچی دوایی کرد، ئەوەی مایەی خۆشحاڵیی من بوو دانیشتوانی گوندەکەمان بۆ من بوون بە کەس و کارو دایك و پیرۆزباییان لێ دەکردم و هانیان دەدام..

## ئەو مزگەوتانەی کە شێخ مەحمود تێیدا بە قورئا نخوێن دامەزراوە:

لە ساڵی ١٩٥٩ لە مزگەوتەکانی ( رفاعی و ئیمام حوسێن و ئەحمەدی) دامەزراوە لە سەرەتای شەستەکانیش تاوەکو ساڵی ١٩٨٠ بۆ دواجار لە مزگەوتی (ئیمام حوسێن) ی شاری قاهیرە دامەزراوە.

لە کاتی گەشتەکەی بۆ بەجێ هێنانی فەریزەی حەج و پاش مەناسیکەکانی حەج دەچێتە نزیك گۆڕی پێغەمبەر (درودو سەلامی خوای لێبێ) دادەنیشێ، خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ویستم بخوێنم! بەڵام لە ناخی دڵمەوە پرسیارم لەخۆم کرد و وتم (چۆن بخوێنم لەکاتێکدا پێغەمبەر لەبەرامبەرمە!!).. هەروەها دەڵێ: هۆن هۆن فرمێسك بە ڕوومەتمدا هاتە خوارەوە و لە بێ

هۆشیدا بووم ئۆقرەم گرت و خوێندم و بەناوی خوا دەستم پـێ کـردو سـورەتی (الاحـزاب)م، خوێنـد تـاکو گەیـشتمە ئایـەتی ﴿یاأیها النبي إنا ارسلناك شاهدا ومبشرا ونذیرا﴾.. نزیکەی بیست جارێك ئەم ئایەتەم دووبارە کردەوەو هۆشم لـەلای خـۆم نەما وام هەست دەکـرد لـە بەرامبـەر خـودی پێغەمبـەری ئـازیز دانیشتووم.. لەناکاو لەگـەڵ جووڵـەی خەڵکەکـە بـەهۆش خـۆم هاتمـەوە، لەوکاتـەی سـەراپای گیـانم لـە لـەرزین دابـوو و ژێـر چەناگەم لەگەڵ فرمێسکی چاوانم تەڕببوو..!!

شـێخ (مـەحمود) دەڵـێ: بـاوکم زۆر هـەوڵی لەگـەڵ دەدام مزگەوتێك لـە گوندەکـەی خۆمـان دروسـت بکـەم، بـەڵام دایکـم ڕازی نـەدەبوو دەیـوت: نـا شـتی وانەکـەیت نـەبادا چـاوەزار بەخـەت بگرێـت و بمریـت.. چـونکە دایکـم ئـەم فەرموودەیـەی پێغەمبەر ی بە ڕەوانی لەبەر کردبوو کە فەرموویەتی (اتقو سـم الاعـین فإنهـا تـدخل الجمـل في القـدر وتـدخل الرجـل القـبر) لەبەرئـەوەی دایکـم منـی زۆر خـۆش دەویـست و دەیـووت بـا لەچاوەزاری خەڵکی پارێزراوبیت!

سەرەنجام (مەحمود) فەرمانەکانی باوکی بەجێ هێناو لە ساڵی ١٩٨٣ ی زایینـی لـە گونـدی (شـبراباص) مزگـەوتێکی دروسـت

کردو بەر لەوادەی مردنی واتە دوای دوو ساڵ مزگەوتەکە بنیاتنرا و جارجارە ئەگەر بواری بۆ بڕەخسابایە ئەوا خۆی سەرپەرشتی زۆرێك لە کارەکانی دەکرد..

(شێخ مەحمود بەننا) لە ساڵی ١٩٨٥ سەردانی شاری (ئەبوزەبی) وڵاتی ئیماراتی عەرەبی یەکگرتووی کرد و لەو ساڵەدا خەتمی قورئانی پیرۆزی تۆمارکرد.. بەڵام دوای گەڕانەوەی دووچاری نەخۆشییەکی کتوپڕ بوو و تواناو هێزی لێ بڕا! ڕاستەوخۆ لە نەخۆشخانە خەوێنرا و ماوەی دوو هەفتە مایەوە.

دوو ڕۆژ بەر لە ماڵئاواییکردنی بانگی کوڕە گەورەکەی کردو داوای لێ کرد پێنووس و کاغەزێك ئامادە بکات.. پاشان وتی بینوسە: ئەمڕۆ (مەحمود) ی قورئانخوێنی ڕادیۆکان لە تەمەنی سەرووی پەنجا ساڵییەوە ڕۆحەکەی دەچێتە بەر دلۆڤانی خودای هەموو جیهانیان..

پاشان وتی: بینووسەو وەسیەتەکانم مەبڕە و گوێ بگرە.. (ئەو هەموو پارە و پوولەی لە دنیا کۆمکردبۆوە گشتی بدەن بە هەژارو نەداران و بەشێك بۆ منداڵەکانمان بهێڵەوە، هەروەها لەکاتی مردنم و لەکاتی شۆردنی تەرمەکەم و پاش کفن کردنی

کاسێتێك لە کاسێتەکانی دەنگی خۆم لە ژوور سەرم دابگیرسێنن و لە کاتی بەخاك سپاردنیشم کاسێتەکەم بۆ لێبدەن!!)

لە کاتی وەسیەتەکانیدا هیچ کەسێك نەیتوانی قسە بکات و تەنها فرمسێك ڕشتن و سوپاسی خودا نەبێت.. کەمێك پاش وەسیەتەکانی شێخ (مەحمود بەننا) هەناسەتەنگی ڕووی تێ کرد و چاوەکانی لێکنا و بە یەکجارەکی ماڵئاوایی لە دنیا کرد.. هەزاران ڕەحمەت لە گیانە بەرزەکەی بێت، چونکە هەموو ژیان و هەستان و دانیشتن و جووڵەو ڕۆیشتنی بۆ خزمەتی قورئان تەرخان کردبوو..

ئەوەی شایانی باسکردن بێت ڕۆژێك بەر لە کۆچکردنی داوای لە قوتابیانی و کوڕەکانی کرد کە دەیەوێت (شێخ محەمەد متەوەلی شەعراوی) ببینم، چونکە لە ژیانیدا شێخ شەعراوی تاکە هاوەڵ و هاندەری بووە، هەواڵ گەیشت بە شێخ شەعراوی کە شێخ مەحمود داوای بینینی تۆ ئەکات.

شێخ شەعراویش هاتە لای کە بینی لەنێوان ژیان و مردندایە بێدەنگ وەستا و زۆر گریا، پاشان بەرەو ڕووی هات و تێر تێر دەست و نێو چەوانی یەکتریان ماچ کرد، شێخ مەحمود بەننا

به دەنگێکی حەزین و قورگێکی پڕ لە گریان داوای لە شێخ شەعراوی کرد کە خۆی نوێژی مردووی لەسەر بکات و بە دەستەکانی خۆی سپاردەی گۆڕی بکات.. بەڵێ کە شێخ شەعراوی ڕۆژێك دواتر بە هەواڵی لە دنیا دەرچوونی زانی تێرتێر گریاو ئامادەی ناشتنی تەرمەکەی بوو و داواکارییەکانیشی بەجێ هێنا کە ڕۆژێك بەر لە مردنی ڕایسپاردبوو، دوای تەڵقین، شێخ شەعراوی لەسەر گۆڕەکەی دانیشت و بە گریانەوە ئەو نزایانەی بۆ کرد: (أللهم أثبه خير ثواب عن كل حرف تلاه وعن كل من سمع حرفا وعن كل ما أذيع له من القرآن).

لە دوای خۆیشی پێنج کوڕ و دوو کچی بەجێ هێشت کە گەورەکەیان ئەندازیارە و ناوی (شەفیق)ە و ئەوانی تر (عەلی) پسپۆڕی بواری کۆمپیوتەرە و (ئەحمەد) قورئانخوێن و (محەممەد) پزیشك و (شەرەف) ژمێریار و هەردوو کچەکەیشی دەرچووی کۆلێژن و شوویان کردووە.



## کامل یوسف البهتیمی

ناوی تەواوی (یوسف زەکی) یە.. ئەم قورئان خوێنە قوتابی و پەروەردەی دەستی شێخ (محمد الصیفی)یە و، لە گەڕەکی (بهتیم) ی سەر بە پارێزگای (القلیوبیە) لە ساڵی ١٩٢٢ ی زاینی لە دایکبووە، لە منداڵییەوە کەسێکی ئاقڵ و گوێڕایەڵ بووەو لە تەمەنی شەش ساڵییەوە دەستی داوەتە پیرۆزترین کتێب کە ئەویش (قورئانی پیرۆزە)... ئەو لە سەرەتای تەمەنی دەساڵییەوە هەموو قورئانی لەبەرکردووە و لەو تەمەنەدا بۆ یەکەمجار لە مزگەوتی گەڕەکەکەی خۆیان بانگی داوە، پاشان پێشنوێژخوێنی مزگەوتەکە ڕۆژانە داوای لێ کردووە بە دەنگە خۆشەکەی بانگ بدات.. تا وای لێ هات خەڵکان بەدەنگە خۆشەکەیان زانی و بۆ هەموو بۆنە و پرسەیەك بانگهێشتیان دەکرد و ئەم کارەی قورئان خوێن تاوەکو سەرەتای پەنجاکان درێژەی خایاند.

وەنــەبێ خوالێخۆشــبوو بەرامبــەر بــە پــارە و پــووڵ قورئــانی خوێندبێ، بگرە هەموو بۆنەیەك لە بەر ڕەزامەندی خــوا و بــەبێ بەرامبەر قورئانی خوێندووە.

هەروەها بە بـەردەوامی لاسـایی دەنگـی قورئانخوێنـان (محمـد سـەلامە) و (محمـد ڕەفعـەت) ی دەکـردەوە، تـا گەیـشتە ئـەو ڕادەیەی نزاکـانی دایکـی گیرابـوون، چـونکە لـە هـەموو کـات و ساتێك لە خوا دەپاڕایەوە کە کوڕەکەی قورئـان لەبـەر بکـات و دەنگ خۆشێکی کارامەی لێ دەربچێت.

شێخ بەهتیمی لە ساڵی ١٩٥٢ی زاینی ڕووی لـە شـاری قـاهیرە کردوو بووە قوتابییەك لە قوتابخانەی شێخ (محمـد الـصیفی) و لە شەقامی (نجیب) ی گەڕەکی عەباسە پارچـەیەك زەوی کـڕی و کردی بە خانوو.

ئــەم قورئانخوێنــە لــە هــیچ پــەیمانگاو قەتابخانەیــەك فێــری قورئانخوێنــدن نــەبووە، بــەڵکو بەخــشش و بەهرەیــەك بــووە خودای گەورە پێی بەخشیوە، هەروەها لە ڕێگەی گوێگرتنی لە ڕادیۆ بەتایبەتی لە دەنگی (محمد سەلامە و محمـد ڕەفعـەت) و

هەندێك زانیاری لە (محمد الـصیفی) فێـری خوێـندنی قورئـان و جۆرەكانی مەوال و تەجوید و ئەحكامەكانی بووە.

## كەی پەیوەندی بە ئێزگەوە كردووە؟

بۆ یەكـەمجار و بـە یارمـەتی شـێخ (محمـد الـصیفی) لـە سـاڵی ١٩٥٣ گەیشتە ئێزگەی قاهیرە.. بەڵام لەكاتی چوونە ژوورەوە و ئامـادەبوونی لەبـەردەم لێژنـەی تاقیكردنـەوەی دەنـگ و پـسپۆڕانی بـواری خوێنـدن، هەسـتی بـە شـەرم و دڵـەڕاوكێ كـردووە، چـونكە ڕۆژێـك لـە ڕۆژان لـە هـیچ پەیمانگەیـەك نەیخوێنـدبوو .. پاشـان زۆری لـەخۆی كـرد و بـەناوی خـودا دەستی پێ كرد و ئەنجامێكی بـاش و سـەركەوتووی وەدەسـت هێناو مانگانە بڕی چوار جونەیهیان بـۆ بڕییـەوە وەك مووچـەی مانگانە بەرامبەر بە تۆمـاركردنی قورئـان لـە ئێزگـە و هـەر لـەو ساڵە كرا بە قورئان خوێنی مزگەوتی (عمر كـرم) لـە گۆڕەپـانی (تحریر)ی قاهیرەی پایتەخت تاوەكوئـەو ڕۆژەی كۆچـی دوایـی كرد.

لە ساڵی ١٩٦٧ی زاینی شـێخ (كامـل بهتمـی) سـەردانی شـاری (پـۆر سـەعید) ی كردوبەشـداری لـە پرسـەیەك كـرد، بـەڵام

دووچـاری ڕووداوێکـی نـاخۆش بـوو، دەبـێ ئـەم ڕووداوە چـی بێت..؟

لەگەڵ دەستپێکی سەردانەکەی شێخ کامل دەستی بە قورئـان خوێندن کـرد، لـەناکاو دەنگـی نووسـاو تەنگەنەفەسـی مـاوەی نەدا چیدیکە درێژەبە قورئان خوێندن بدات!

ئامادەبووانی پرسەکە بەپەلە گەیاندییانە نەخۆشـخانە و چـەند ڕۆژێك لە نەخۆشخانە خەوێنرا، پاشان کە بەهۆش خۆی هاتەوە گـوتی: بـەر لـە قورئانخوێنـدن فنجانەیـەك قـاوەم خـواردەوەو هەستم کـرد دەرمـانی تێکـراوە!! (عاصـم) ی کـوڕە گـەورەی دەڵێ: پزیشکەکان بە گوێیان چرپاندم (ئەمە هەوڵێك بووە بۆ لـەناوبردنی ئێـستاکەش دووچـاری بـەربوونی خـوێن بـووە بەتایبەتی نیوەی مێشکی گرتۆتەوە)، پاش چەندین دەرمـان و چارەسەر هیچ سـوودێکی پێنەگەیشت و دوای یـەك هەفتـە بـە یـەکجارەکی لـە پـێ کـەوت و تووشـی (ئیفلـیج) بـوون هـات، هەرچەندەی ئەوکارەسات و جـۆرە نەخۆشـیانە ڕوویـان تێکـرد خوالێخۆشـبوو خۆڕاگربـوو و سوپاسـی خـوای دەکـرد و، دڵـی دایکی دەدایەوە و دەیگوت (دایە گیان ئارامگربە ئـەوەی خـودا بیهێنێت هەر ئەمیان تەواوە).

بۆدواجار دوای دوو ساڵ بە ئیفلیجی و لەسەر جێگا کەوتن شێخ کامل لە ٦/٢/ ١٩٦٩ و لە تەمەنی چل‌و حەوت ساڵان گیانە بەرزەکەی لە شەقەی باڵیدا و ئەمری خودای بەجێهێنا بەبێ ئەوەی دەسەڵاتدارانی حکومەت لێکۆڵینەوە لە کوشتنەکەی بکەن و ئاشکرابێت بزانن بکوژەکەی کێ یە ! !



## ﴿ شعبان الصياد ﴾

کەسێکی لادێیی لە بنەماڵەیەکی ئیماندار و لە باوك و دایکێکی لادێیی لە گوندی(صراوە) ی سەر بە پارێزگای (ألمنوفیە) لە بەرواری ۲/ ۹ /۱۹٤۰ ی زایینی لەدایك بووە...

ئەو کەسە (شەعبان عەبدولعەزیز ئیسماعیل سەیاد)ە و خاوەن دەنگێکی زۆر خۆش بووەو نموونەی کەم بووەو هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ دەنگی قورئانخوێن شێخ (محمد رەفعەت) نەبووە..

باوکیشی قورئان خوێنێکی کارامەو خاوەن ئەزموون بووەو ئەوکاتەی شەعبان تەمەنی گەیشتۆتە چوار ساڵان ، واتا لە ساڵی ۱۹٤٤ی زایینی باوکی کۆچی دوایی کردووە.

یەکێك لە کارە هەرە سەرسوڕهێنەرەکانی شێخ (شعبان الصیاد) ئەوەبووە، کە لە تەمەنی حەوت ساڵان هەموو قورئانی لەبەرکردووە، بەو هۆیەوە بۆتە جێگەی شانازی گوندەکەی..

لە تافی لاوێتیدا چۆتە زانکۆی ئەزهەر و بۆتە قوتابی لە کۆلێژی (اصول الدين) هۆبەی (العقيده و الفلسفه)، جگە لە کۆلێژ لە بۆنە و ئاهەنگەکان بە بەردەوامی قورئانی دەخوێند و دڵ و گوێی بیسەران و ئامادەبووانی دەهێنایە جۆش و بە یەکجارەکی ناوبانگی دەرکرد..

بۆ نموونە دوو شەو لەسەر یەك بەشداری لە ئاهەنگێکی قورئانی پیرۆز کرد و شەو خۆی بۆ نەگیرا و کەوتە خەوێکی قووڵ و بەدەم نووستنیشەوە هەر قورئانی پیرۆزی لەدەستا بوو، لەوکاتە شێخ (مستەفا ئیسماعیل) دێتە ژوورەوەو ئەم دیمەنە دەبینێ بە قوتابییەکانی دەڵێ: ئەم گەنجە ئایندەیەکی ڕووناك و دواڕۆژێکی پڕشنگدار ڕووی تێ دەکات.

ئەوکاتە دەبینن کە چ قورئان خوێنێکی نایابی لێ دەردەچێ!!

ڕووداوێکی ناخۆش ڕووی لە شێخ (شعبان الصياد) کرد.. دەبێ ئەو ڕووداوە چی بێت؟

له ساڵی ١٩٦٩ شێخ شـهعبان دهگهڕایـهوه، ماڵـهوه لهکاتێکـدا دهبـینێ بـه دهیـان ئۆتـۆمبێلی پـۆلیس و ئاسـایش و چـهندین ئهفـسـهر دهوری ماڵهکــهیان گرتــووه و دهرو دراوسێکانیــشی کۆبوونهتــهوهو لـــه یــهکتری پرســـیار دهکــهن دهبـــێ چـــی روویدابێت؟

شـێخ (شـعبان الـصیاد)یـش لـه ئهفـسهرێك نزیـك دهبێتـهوهو دهپرسێ کاکی ئهفسهر چی روویداوه؟

که ئهفسهرهکه دهزانێ ئـهو کهسـه شـێخ (شـعبان الـصیاد) ه، پێی دهڵێ ئێمه فهرمانمان پێیه که دهبێ بێیته پرسهی (جمال عبدالناصر) که ئهمڕۆ کۆچی دوایی کردووه..

ئهفسهرهکان بهبێ ئهوهی گوێی لێ ڕابگرن ڕاستهوخۆ سـواری ئۆتۆمبێلی دهکهن و بۆ پرسهکهی ئهبهن.

بۆیهکهمجار له ساڵی ١٩٧٥ لهسهر داوای کۆمـهڵێك زانـاو چـهند پسپۆڕێکی بواری مۆسـیقا بـۆ تاقیکردنـهوهی دهنگی گهیـشته باڵهخانـهی ڕادیـۆ و تهلـهفزیۆنی میـسر.. دهنگـه بهسـۆزهکهی تاقیکرایـهوهو بـه پلـهی زۆر باشـه ئهنجامهکـهی دهرچـوو و لـه

هــەموو بەرنامەیــەکی ڕادیــۆ و تەلــەفزیۆن بــە ڕاســتەوخۆیی قورئانی دەخوێندەوە.

هەروەها هەموو ڕۆژانێکی هەینی ڕادیۆو تەلەفزیۆن ڕوویـان لـەو مزگەوتــە دەکـرد کـە نـاوبراو لەوێـدا قورئـانی دەخوێنـد، کـە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ بینەران و گوێگران دەگوێزرایەوە.

دەڵـێن هـەموو جارێـك کـە ئەنـدازیارەکانی دەنگـی بـەدوایان دەنـارد لـە کـاتی خـۆی ئامـادە ئـەبوو و ڕێـك لەگـەڵ هـەڵس وکەوتی هونەرکارانی ستۆدیۆکانی ڕادیۆ دەگونجاو مـاوەی نیـو کاتــژمێری لەبەردەمــدابوو، ئــەویش بــەبێ هەڵــەو بــێ ئــەوەی ئایەتــەکان دووبــارە بکاتــەوە بــە ســەرکەوتوویی دەنگــی تۆماردەکرا..

هەروەها لە بارەیەوە وتراوە: لـە قورئـان خوێنـدن ڕێـچکەیەکی تایبـەت بـەخۆی هـەبووە، کـەس وەکـو ئـەو هەناسـەی درێـژ

نەبووە و توانای هەبووە چەندین(تەبەقە) ی دەنگی ببڕێت کە لە هەر ئایەتێك جۆرە تەبەقەیەکی بەکارهێناوە.

شێخ (شعبان الصیاد) کەسێکی بێ فیز بووەو زۆریش موتەوازیع بووەو ڕێزی هەموو کەسێکی گرتووەو ئاشنایەتی لەگەڵ هەموو قورئان خوێنێك پەیداکردبوو، هەردەم دەیوت (من لە نازی باوکایەتی بێ بەش بوویمە و بە پیاوەتی لە دایك بووم) هەروەها لەماڵەوەش بنکەیەکی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزی بۆ خێزان و منداڵەکانی دامەزراندبوو، ڕێگەی پێ نەدەدان بە تەنها نوێژەکانیان بکەن، بەڵکو دەبێ بە کۆمەڵ نوێژەکانیان ئەنجام بدەن.شێخ (شعبان الصیاد) وەنەبێ تەنها لە قورئان خوێندن ڕۆڵی هەبووبێ، بەڵکو لە زانستە شەرعیەکانیش ڕۆڵی هەبووەو بە بەردەوامی لە دوای قورئانخوێندن خەڵکان پرسیاری شەرعیان ئاراستە کردووەو

ئەویش ڕاستەوخۆ وەڵامی دەدانەوە، چونکی خۆی یەکێك بووە لە زانا هەرە ناودارەکانی زانکۆی ئەزهەر..

شێخ (شعبان الصیاد) لە ساڵی ١٩٩٤ نەخۆشیەکی کت و پڕ ڕووی تێدەکات و چوار ساڵ یەخەی بەرنادات، تاوەکو لە بەرواری ١٩٩٨/١/١٩ لە پیرۆزترین و گەورەترین ڕۆژ کە یەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانی پیرۆزە ماڵئاوایی لە دنیای فانی دەکات، کە هاوکات بوو لەگەڵ بەرواری یەکی شەوالی ساڵی ١٤١٩ی کۆچی.. تەرمە پیرۆزەکەی بە ئامادەیی جەماوەرێکی زۆر گەیەنرایەوە شوێنی لەدایك بوونی کە گوندی (صراوە) یە.. بەڵام مخابن پاش چەند ساڵ خزمەتکردن لە ئەزهەر نە شێخی ئەزهەر بروسکەیەکی ماتەمینی نارد و، نە خۆیشی نە نێردەکەیشی ئامادەیی ناشتنی تەرمەکەی نەبوون، چونکە ڕۆژێك لە ڕۆژان بەدوای کاربەدەست و سەرۆکێك نەکەوت وەك ئەوەی ئەوان تەمەننایان دەکرد..



وێنەی قورئان خوێن لەیەکێك لە پێشبڕکێکانی قورئانی پیرۆز

قاهیرەی پایتەخت ساڵی ١٩٧٢



## ﴿ سيد النقشبندي ﴾

بێگومان پێشەوای هەموو تەواشیح بێژێکە.. خاوەنی دەنگێکی بـەهێزو ویـژدان هەژێنــە، لەگـەڵ چـریکەی دەنگـی دڵـەکان دادەخورپێن و چاوەکانیش پڕ دەبن لەئـە شـك، لـە گریـان، لـە ڕووبارێك فرمێسك، ئەم نازناوە شـایەنیەتی کـە پێیـان گوتـووە (لحن ملائکي لم یکتمل).. نازناوێك کە زۆر دەرفەتی نەدا زیـاتر بە ستایـشە جوانـەکانی ئیـسلام بـۆ ڕۆژاوا و ڕۆژهـەڵات پێنـاس بکات.

ئەم گەورە مرۆیە شێخ (سەید نەقشبەندی کوڕی تـەنتا)یـە.. و لە ساڵی ١٩٢٠ی زایینی لە گوندی (دمیرە)ی سەر بە پارێزگـای (ألدهقلیە) لە دایك بووە، هەر لە تەمەنی منداڵییەوە بـاوکی بـۆ شاری (تەنتا) ی سـەر بـە پارێزگـای (سـوهاج) ی گواسـتۆتەوە کـە لــەنێو کـۆڕ و کۆمەڵەیــەکی سـۆفیگەرێتی گۆشــکرا بــۆ

خۆشویستنی خوداو پێغەمبەری نازدار (درودو سەلامی خوای لەسەربێ).

زۆر ڕاستگۆ و زاهید و خواناس بووە، بۆ یەکەمجار لە ئاهەنگی یادی لەدایك بوونی ئیمام (حوسێن) ناوبانگی دەرکرد کە لە گۆڕەپانی (سید الشهدا ) چەندین تەواشیح و سرووودی لەسەر پێغەمبەری ئیسلام خوێندەوە خەڵکانی سەرسوڕمانکرد..

بۆیەکەمجار لە ساڵی ١٩٦٧ ڕووی لە ئێزگەکان کردو چەندین تەواشیحی ئاینی لەگەڵ نۆتەی مۆسیقا تۆمارکرد کە دەنگیدایەوە، ئەویش سروودەکانی (مولای انی ببابك) و (یادار الارقم) و ( إخوة في الله) و (شهر رمضان) و چەندین مەوال و تەواشیحی تر.

لە ڕێگەی مەدح و تەواشیحەکانی خەڵکانی بانگ دەکرد کە برای یەکتربن بە تەنها بۆ ئیسلام بژین و بمرن.. زۆربەی نووسەر و ڕۆژنامەنووسە عەرەبەکان بابەتیان لەبارەی سەید نەقشبەندی نووسیوە، هەندێکیان ناویان ناوە ( قیثارة السماء) و (إمام المداحین).. هەروەها دکتۆر (مستەفا مەحمود) لە بەرنامەی (العلم والایمان) لە بەرنامەیەکی تایبەت بە یادی خوالێخۆشبوو نازناوی (نور الکریم)ی پێ بەخشیبوو.

له ژیانیدا زۆر به هەژار و بە دەستپاك و خێرخواز ناسرابوو، دوو ژنیشی هێنابوو که چوار کورو دوو کچی هەبووە.

زۆربەی خەڵکی (تەنتا) ئێستاکەش یادی ئەو شەوانە دەکەنەوە کە خوالێخۆشبوو لە شەوانی قەدر و کاتی ئیمساك و بەربانگ تەواشیحی لە مزگەوتەکان دەخوێند، دەنگی ئەوەندە بەهێزبووە لە دوورایی چەندین کیلۆمەتر دەنگەکەی دەبیسترا. هەربۆیە لە ساڵی ١٩٧٩ لە شاری (تەنتا) شەقامێکی بەناونراوە..

سەید نەقشبەندی چەندین کاسێتی تەواشیح و قورئانی لەدوای خۆی بەجێ هێشت بەتایبەتی کاسێتی قورئان و بەتایبەتی تر سورەتی(ألمزمل) که چەند جارێك ئایەتی ﴿یوم یجعل الولدان شیبا﴾ دووبارە دەکاتەوە و ویژدانی مرۆڤ دەهەژێنی.

بۆدواجار لە بەرواری ١٤/ی فبرایەری ١٩٧٦ و لە تەمەنی پەنجاو شەش ساڵان بە نەخۆشییەکی کت وپڕ گیانی پیرۆزی بەخودا سپارد.



## ﴿ راغب مصطفى غلوش ﴾

ئـەم قورئـان خوێنــە ئەمڕۆکـە بۆتــە یـەکێك لـە قورئانخوێنــە ناودارەکانی جیهانی ئیسلامیی، کە زۆربەی هەرە زۆری بینەران لــە شاشــەی تەلەفزیۆنەکانـدا دەیبیـنن و لـەڕێی شـەپۆلەکانی ڕادیـۆش گوێبیـستی دەنگــە بەسـۆزەکەی دەبــن.. خــاوەن دەنگێکی خۆش و هەناسە درێژە..

لە بەرواری ١٩٣٨/٧/٥ ی زایینی لـە گونـدی (برمـا) ی تـەنتای ســەر بــە پارێزگــای (غــەربی) لــە دایـك بــووە، تەمــەنی زۆر بــچکۆلانەبووە، بــاوکی بردوویــەتی بــۆ لای شــێخ (عبــدالغنی الـشرقاوی) لـە گوندەکـەی خۆیـان و فێـری قورئـان خوێنـدن و ئەحکامــەکانی تەجویـدی کــردووە، بــە هــۆی گوێڕایــەڵی لــە مامۆسـتاکەی لـە تەمـەنی نـۆ سـالان هـەموو قورئـانی پـیرۆزی

لەبەرکردووە، لەتەمەنی چواردە ساڵان بە تەواوەتی ناسرا، لەو کاتەی لە مزگەوتی گوندەکەی خۆی بانگیداو قورئانی خوێند.. پاشان پەیوەندی و ئاشنایەتی لەگەڵ قورئانخوێنان (مستەفا ئیسماعیل و مەحمود خەلیل ئەلحوسەری و محەممەد سدیق ئەلمەنشاوی) پەیداکرد، لە ژیانیشدا بەو سێ قورئانخوێنە سەرسام بووە..قورئان خوێن زیاتر لە پەنجا ساڵە بە بەردەوامی سەردانی وڵاتانی ئیسلامیی دەکات و بەبێ بەرامبەر و وەرگرتنی درهەم و دینارێك قورئان ئەخوێنێت، وەك ئەڵێ: من لەبەر ڕەزامەندی خودا قورئانم خوێندووە و ئەیخوێنم، چونکە گوناهە بۆ کەسێك بە پارەوپوول قورئان بخوێنێت.قورئانخوێن سەربووردەی خۆشی لەگەڵ قورئانخوێنی خوالێخۆشبوو (محمد صدیق المنشاوی) هەیە.. بۆنموونە دەیگێڕێتەوە کە لە ساڵی ١٩٦٥ ئاگادارکرام کە دەبێ هەموو ڕۆژێك لەکاتژمێر دوانزەی نیوەڕۆ تاوەکو کاتژمێر یەکی نیوەڕۆ

سەردانی ئێزگە بکەم بۆ تۆمارکردنی خەتمی قورئانی پیرۆز بە شێوەی تەرتیل و دەبێ پابەندی کاتەکەم بم و دوانەکەوم.. ڕۆژێك لە ڕۆژەکان بۆ پرسەیەك بانگهێشت کرام کە لە شاری (المنفیە) بوو، منیش کاتژمێرێك زووتر ڕووم کردە ئێزگە لەوکاتەدا شێخ (محەممەد مەنشاوی) هەزاران ڕەحمەتی خودای لێبێت لە ژووری ستۆدیۆ دانیشتبوو بۆ تۆمارکردن و تەواوکردنی خەتمی قورئانی پیرۆز، چونکە هەموو ڕۆژێك خوالێخۆشبوو کاتێکی بۆ تەرخان کرابوو، کە کاتژمێر یانزەی پێش نیوەڕۆ بوو، منیش بە پەلەبووم هەواڵەکەم بە بەڕێوەبەری ئێزگەکەڕاگەیاند ئەویش بە شێخ محەممەد مەنشاوی ڕاگەیاند لەوکاتەدا شێخ مەنشاوی هەڵسایە سەرپێ و پێی وتم ئەی (راغب) من و تۆ تەوفیرمان نییە فەرموو دانیشە و بخوێنە و تۆماری بکە.. مەنشاوی هەموو کاتەکەی خۆی دا بە من و ڕۆیشت و نزای بۆکردم کە لە خوێندنەکە سەرکەوتوو بم و

له گەشتەکەش خودا بمپارێزێت.شێخ راغب ئێستاش لـه ژیانـدا مـاوەو لـه سـاڵی ١٩٥٢ی زاینـی تـاوەکو ئـەمڕۆ لـه خزمـەتی قورئاندا دەژێی و ڕۆژانی هەینیش له مزگەوتی (دسوقی) شاری (دسوقی) قورئانخوێنه.



## ﴿ محمود صديق المنشاوى ﴾

کوڕی سدیق ی قورئـان خـوێن وبـرای قورئـان خـوێنی نـاودار و خوالێخۆشـبوو (محمـد صـديق المنـشاوى ) یـه . ئـهم قورئـان خوێنـه لهسـاڵی ١٩٤٣ ی زایینـی لـه پارێزگـای ( سـوهاج ) ی میسری لهدایك بـووه ، هەرلەتەمـەنی منالّیـدا سـدیقی بـاوکی و محەممەدی برای لەگەڵ خۆیان بۆ هەموو ئاهەنگ و پرسـەیەکی قورئان خوێندنیان دەبرد و ، لەسەرەتای خوێندنی قورئـان زۆر بەمحەممـــەدی بـــرای سەرسـام بـــووه و، لاســـایی ئـــەوی کردۆتەوه .قورئانخوێن لەژیانیدا سەردانی ئەم وڵاتانەی کـردووه و بەشداری کردووه لەئاهەنگی قورئان خوێندن ( مالیزیا ،کوێت ، ئیمـارات ، یەمـەن ، سـودان ، ئێـران ،سـودان ، باشـووری ئەفریقیا) بەم دواییانەش خەتمێکی قورئـانی لـەڕادیۆی قـاهیره تۆمارکردووه ..



## ﴿ أبو العينين الشعشاعى ﴾

شێخ (أبو العينين الشعشاعى) زیاتر له نیو سەدەیە لە خزمەت قورئاندا هەموو کات و ساتێك لەگەڵ قورئان گوزەردەکات و کاتەکانی دەباتەسەر.. ناوبراو لە ساڵی ۱۹۲۲ی زاینی لە شارۆچکەی (بێلا)ی سەر بە پارێزگای (کفر) ی میسری لە بنەماڵەیەکی هەژار هاتۆتە دنیاوە..لەتەمەنی حەوت ساڵان خراوەتە بەر خوێندن و پاشان لە تەمەنی دوانزە ساڵان ڕووی لە قورئان کردووە و لە ماوەی دوو ساڵدا هەموو قورئانی لەبەرکردووە، لە تافی هەرزەکاریدابووە باوکی ئارەزووی کردووە لە دوارۆژکورەکەی ببێت بە ئەفسەر لە سوپای دەوڵەت! بەڵام کە بە قورئان خوێن دەرچوو، باوکی زیاتر و زۆرتر دڵی خۆشبوو و هەڵوێستی گۆڕا بەرامبەر بە پاشەڕۆژی کورەکەی.

بۆیەکەمجار لە ساڵی ١٩٣٦ کە تەمەنی گەیشتە چواردەساڵان قورئانی خوێند، ئەویش بە ئایەتی ﴿ولاتحسبن الذين قتلوا في سبيل الله أمواتا بل أحياءٌ عند ربهم يرزقون﴾ کە لە گۆڕەپانی قوتابخانەکەی لەسەر داوای مامۆستاکانی خوێندیەوە، بەڵام لەسەرەتادا شەرمێکی زۆر گرتی، کە سەری هەڵبڕی ئامادەبووان بە دڵەوە گوێی بۆ دەگرن زۆری لەخۆی کردو شەرمەکەی شکا.

لە ساڵی ١٩٤٢ و لە شەوی قەدری پیرۆز (شا فاروق) خەڵاتی ڕێزلێنانی پێ بەخشیووە.

یەکەم قورئانخوێن بووە سەردانی دەرەوەی وڵات بکات بۆ قورئانخوێندن، ئەویش گەشتەکەی بوو بۆ وڵاتی فەلەستین، لە ساڵی ١٩٤٠ ی زایینی، کە سێ مانگی خایاند و لە میانەیدا لە مزگەوتی ئەقسا ڕۆژانی هەینی قورئانی دەخوێند، هەروەها یەکەم کەس بووە بەر لە ساڵی ١٩٥٠ لە مانگی ڕەمەزاندا بۆ ڕادیۆکان (بانگ) تۆمار بکات، کە نیوەڕۆیان و ئێواران بۆ گوێگران پەخش دەکرا، شێخ (أبو العينين الشعشاعي) لە ژیانیدا ڕێچکەی دەنگی (محمد رفعت)ی گرتووە و لاسایی ئاوازەکانی ئەو ئەکاتەوە.لە ژیانیدا سەردانی وڵاتانی (عێراق و

ئێران و تورکیا و ئیمارات و بەریتانیا و یۆگسلافیا و سەراییڤۆ و لوبنان و سوریاو ئوردەن و فەلەستین) ی کردووە، هەروەها لە حەفتاکان سەردانی شاری ئەبوزەبی کردووە و لەسەر داوای میری دەوڵەتی ئیمارات خەتمێکی قورئانی تۆمارکردووە، کە شانبەشانی (عبدالباسط عبدالصمد)ی قورئانخوێن سەردانی ئەو وڵاتەیان کردووەو بە جیا لە دوو ستۆدیۆ خەتمەکەیان تۆمارکردووە کە نزیکەی دە ساڵی خایاندووە.. قورئان خوێن لە ژیاندا ماوە، کە کاری ئێستای جێگری یەکەمی سەرۆکی سەندیکای قورئانخوێنانە لە قاهیرەی پایتەختی میسر.



وێنەی (ابو العینین و مصطفی اسماعیل) ١٩٤٨



## ﴿ سيد سعيد ﴾

له ساڵی ١٩٤٣ زایینـی لـه گونـدی ( میـت مرجـا ) ی سـەر بـه پارێزگای دقهلیەی وڵاتی میسر له دایك بـووه ، لـه تـەمـەنی نـۆ ساڵان هەموو قورئانی لەبەر کردووه له ناوەڕاستی شەسـتەکان ناوبانگی دەرکردووه، هەروەها چەندین جار سەر دانـی وڵاتـانی ئیمـارات و لوبنـان و ئێـران و سویـسرا و باشـووری ئـەفریقیای کردووه و چەندین جار خەڵاتی پێبه خـشراوه نـاوبراو ئێـستاش له ژیاندا ماوه .



## محمـــد جبريل

لەسـالّی ١٩٦٣لـەولاّتی میـسر هاتۆتـە دنیاوەخێزانـدارەو سـێ منالّی هەیەکورێك و دووکچ . پێشنوێژخوێنی مزگـەوتی ( عمـرو بن العاص ) ە، لـەولاّتی میـسر، جگـە لـەوەی قورئـان خوێنـەو دەرچووی کۆلێژی یاسایە.ڕادیۆ و سایتێکی ئینتەرنێتی تایبەت بـەخۆی هەیـە ، لەزۆربـەی ولاّتـانی ئەوروپاوئاسیاوتاری داوەو قورئـــانی پـــیرۆزی خوێنـــدووەو چـــەندەها قوتابیـــشی پێگەیانـدووە.نـاوبراو زیـاتر لـە بیـست سـالّە تـاوەکو ئێـستا لەمزگەوتی( عمرو بن العاص ) پێشنوێژ خوێنـە ،جگـە لـەوەش نووسەروبیریارێکی ڕەسەنی ئیسلامییە، هەروەکو خۆی دەلّێـت :( لەمندالّییـــەوە ئـــارەزووی نووســـینم هـــەبووە، و لەتەمـــەنی نۆسالانیش هـەمووقورئانی پـیرۆزم لەبەرکـــردووە ).. لەسـالّی ٢٠٠٧ ئـەرکی سـەرۆکی رابیتـەی قورئـان خوێنـانی جیهـانی ئیـــسلامیی پـــێ بەخـــشراوە .وە لەچـــەندبابەتێك

کەوەرگێڕدراوەتەسەرزمانی ئینگلیزی و فەرەنسی بەحەرامی دەزانێت لەپرسەکان بەپارە قورئان بخوێندرێت ، قورئان خوێن شارەزاییەکی تەواوی لەهەموو جۆرە مەقاماتەکان هەیە و پرسیارم ئاراستەکرد کەلەسەردەستی کێ فێری جۆرەکانی ئاواز و مەقامات بوویت ؟ لەوەڵامدا ووتی : ئەمەبەهرەیەکە کە خودای گەورەپێی بەخشیوم ، قورئان خوێن بنکەیەکی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزی دامەزراندووە کەزیاتر لە دوو هەزار قوتابی کوڕ و کچ فێری چۆنیەتی خوێندنی قورئان و زانستەکانی تەجوید دەکات .



نوێژی تەراویح لە مزگەوتی عەمری کوڕی عاس
لە میسر ١٩٩٨



وەرگرتنی بڕوانامەی لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز بەتەمەنی (١٠) ساڵی

لە ساڵی ١٩٧٣



لە کاتی پێشکەش کردنی بەرنامەی (لد عاء) لە تەلەفزیۆنی میسر



## ﴿ سید متولی ﴾

لەســـاڵی ١٩٤٧ لەگونـــدی ( فدادنـــە ) ی ســـەربەپارێزگای شەرقیەی میسر لـەدایك بـووە، لەتەمـەنی پێنج ساڵان لـەلای خـاتوو ( مـریم سـید الـرزق ) فێـری قورئانخوێنـدن بـووە، زۆرشـەیداو هـۆگری قورئـانی پیرۆزبـووەو، بـەو هۆیـەوە دەسـبەرداری قوتابخانـە بـووەو بەیـەکجارەکی بۆتـە قوتـابی قورئان.

وەك خۆی دەڵێت لەژیانمدازۆرخۆم بەقەرزاری خاتوو(مریم سید الرزق ) ئەزانم چونکە لەسەردەستی ئەو فێری قورئـانی پـیرۆز بووم .. قورئان خوێن بۆیەکەمجار لەساڵی ١٩٦١ لە پرسەیەکی ماتـەمینی قورئـانی خوێنـد و لـەناو خـەڵك ناسـرا ، تادواجـار

لەسالّی ١٩٨٢ بەیەکجارەکی ناوبانگی دەرکرد، لەژیانیدا سەردانی ئێزگەی نەکردووە. تەنها لە مزگەوتەکان قورئانی بۆتۆمارکراوە، ناوبراو ئێستاش لەژیانداماوەو لەزۆربەی ولآتانی وەك ئێران و ئوردن و میسر قورئانی خوێندووەو دەنگێکی بەسۆز و خۆشی هەیە ..



وێنەی قورئانخوێنان / د. احمد نعینع ، سید متولی ، محمود المنشاوی ، محمد محمودالطبلاوي، شحات محمد انور ، راغب غلوش .. کەئەمڕۆکە بەدەنگە خۆشەکانیان خزمەتی قورئانی پیرۆز دەکەن و لەسەرانسەری جیهانی ئیسلامیی ناسراون ..



﴿ أحمد الطرابلسي ﴾

زۆربەی هەرەزۆری وەرزشوانان دەیناسن لەوکاتەی لە ڕیزی هەڵبژاردەی کوێت یاریزان بووە، لە ساڵی ١٩٤٧ی زاینی لە بەیروتی پایتەختی لوبنان لەدایك بووەو لە ساڵی ١٩٦٣ چۆتە کوێتو دوای ساڵێك ڕەگەزنامەی کوێتی وەرگرتووە، پەیوەندی بە سوپای کوێتی کردووەو پلەی ئەفسەری پێ بەخشراوەو کراوەتە (نەقیب) .. لە ساڵی ١٩٧٤ لە ڕیزی هەڵبژاردەی کوێت وەرگیراوە و کراوەتە گۆڵچی و نازناوی گۆڵچی ئەمین و گۆڵچی باڵابەرزی پێدراوەو، لە جامی کەنداوی عەرەبی لەوساڵەدا هیچ گۆڵێکی لێ نەکراوە. هەروەها بۆ یانەکانی (قادسیە) و (کوێت) یاری کردووەو بۆ دواجار لە ساڵی١٩٨٣ وازی لەیاریکردن هێناوەو، لەساڵی ١٩٩٥ جارێکی دیکەلەگەڵ هەڵبژاردەی کوێت مەشقی وەرزشی ئەنجامداوەتەوە.

لەوساڵەدا واتە ١٩٩٥ روویکردۆتە قوتابخانە ئیسلامییەکان و بەشداری لە چەندین پێشبڕکێی قورئانخوێندن کرد کە دوواهەمینیان لە وڵاتی (بەنگلادیش) بوو.. یەکەم کەس بووە لە مێژووی کوێت کە لە ستۆدیۆکانی ئێزگە قورئان تۆمار بکات، کە ئەویش لە ١٩٩٥ بوو، ئێستاکەش لە ژیاندا ماوەو خاوەن دەنگێکی خۆشەو هەموو جۆرەکانی خوێندنی قورئان بە ڕەوانی دەزانێت.



تەرابلوسی و خێزانەکەی ١٩٨٠



تەرابلوسی کاپتن و گۆڵچی هەڵبژاردەی کوێت ١٩٧٩



## ﴿ علی عبدالرحمن الحذیفي ﴾

شێخ (عەلی عبدولڕەحمان عەلی حوزەیفی) بۆ تیرەی (حذیفة العامري) دەگەڕێتەوەو لە ساڵی ١٩٤٤ ی زایینی لە گوندی (القرن المستقیم) ی وڵاتی سعودیە و لە بنەماڵەیەکی پەروەردەی ئایینی لەدایکبووە، باوکی خەتیبی سوپای سعودیە بووە.

لە تەمەنی شەش ساڵان لە گوندەکەی خۆی خراوەتە بەر خوێندن و پاشان لەلای شێخ (محمد ابراهیم حوزەیفی) فێری قورئان خوێندن بووە و توانیویەتی چەند جوزئێکی قورئان لەبەربکات لە ساڵی ١٩٧١ کۆلێژی شەریعەی لە ڕیازی پایتەخت تەواوکردووە و لەو ساڵەدا بە وانەبێژدامەزراوەو وانەکانی تەفسیرو تەجویدی بۆ قوتابییەکان وتۆتەوەو هەر لەو ساڵەدا بە ئیمام و خەتیبی مزگەوتی (بلجرشی) دامەزراوە.

پاشان لە ساڵی ١٩٧٤ بڕوانامەی ماجستێری لە زانکۆی ئەزهەر وەرگرتووە و لە هەمان زانکۆ توانیویەتی دکتۆرا بۆخۆی

مسۆگەر بکات، کە نامەی ماستەرەکەی لەژێر ناونیشانی (طرائق الحكم المختلفة في الشريعة الاسلامية دراسة مقارنة بين المذاهب الاسلامية) بوو، ئینجا لە زانکۆی ئیسلامیی لە کۆلێژەکانی شەریعەو دەعوەو ئسولی دین وانەبێژ بووە، تاوەکو ساڵی ١٩٩٧ی زایینی.

خاوەن دەنگێکی خۆشەو بۆیەکەمجار لە ساڵی ١٩٨٦ی زایینی خەتمی قورئانی پیرۆزی بەریوایەتی ( حفص عن عاصم ) لە ستۆدیۆکانی شاری مەدینە تۆمارکردووە.

هەروەها لە ساڵەکانی ١٩٧٩ و ١٩٨١و ١٩٨٣ تاوەکو ١٩٩٨ کراوەتە ئیمام و خەتیبی (مسجد النبوی).

قورئان خوێن ئێستاش لە ژیاندا ماوەو گەڕاوەتەوە (مسجد النبوی) وەکو پێشنوێژخوێن دەست بەکارە.



لەمزگەوتی گەورەی ئەندنوسیا ساڵی ٢٠٠٦



ئەندنوسیا ٢٠٠٦ ی زایینی



## ﴿ عبدالرحمن السديسى ﴾

نـاوی تـەواوی (عبـدالرحمن عبـدالعزيز محمـد عبـدالعزيز محمـد عبدالله)يـە و بـە (سودەيـسی ئـەبو عەبدولعـەزين) ناسـراوە، لـە ساڵی ١٩٦٢ی زاينی لەشاری ريازی پايتەختی سعوديە لە دايـك بووە، و لە تەمەنی دوانزە ساڵان واتـە لـە سـاڵی ١٩٧٤ هـەموو قورئـانی پـيرۆزی بـە ڕەوانـی لەبـەركردووەو پاشـان لەسـەر دەسـتی قورئـانخوێن (محمـد عبدالماجـد) فێـری خوێندنـەوەی قورئان بووە.

له ساڵی ١٩٨٤ بەرامبەر بە ساڵی ١٤٠٤ ی کۆچی بە ئیمام و خەتیبی مزگەوتی (الحرام) دامەزراوە، هەر لەو ساڵەو دوای نوێژی عەسر واتە لە ١٩٨٤/٩/١٥ بۆ یەکەمجار وتاری بۆ ئامادەبووانی مزگەوتە پیرۆزەکە خوێندۆتەوە.

لە ساڵی ١٩٩٦ ی زاینی بەرامبەر بە ساڵی ١٤١٦ ی کۆچی پلەی دکتۆرای لە کۆلێژی شەریعەی زانکۆی (ام القری) وەدەست هێناوە.. خاوەنی دەنگێکی خۆش و نەرمە.. تا ئێستا سەردانی ئێزگەکانی نەکردووە بۆ تۆمارکردنی قورئانی پیرۆز، بەڵکو ڕەمەزانانی هەموو ساڵێك بە هاوکاری (سعود الشریم) لە کاتی نوێژی تەراویحەکان خەتمیان بۆ تۆمارکراوە، ئەوەی شایانی باسە قورئانخوێن لە ژیانداماوەو لە شاری (ریاز) ی پایتەخت نیشتەجێیە.



## ﴿ سعد الغامدي ﴾

ناوی تەواوی ( سەعد سەعید غامدییە) و لە شاری (دەمام) ی مەملەکەی عەرەبیی سعودیە لە ساڵی ١٩٦٧ی زاینی لەدایك بووە. زانکۆی (ئیمام محەممەدی کوڕی سعود)ی ئیسلامییی کولێژی (الشریعه تخصص الدین) ی لە ساڵی ١٤١٠ی کۆچی بەرامبەر بە ساڵی ١٩٩٠ی زایینی تەواو کردووە .. لە ساڵی ١٩٩٥ی زاینی هەموو سورەتەکانی قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووەو بۆیەکەمجار لە ساڵی ١٩٩٦ مۆڵەتی قورئانخوێندنی لەسەر ڕیوایەتی (حفص عن عاصم) وەرگرتووە و هەر ئەو ساڵەش خەتمی قورئانی پیرۆزی بۆ تۆمارکراوە، کە لە نوێژەکانی تەراویحی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز خوێندوویەتی. هەروەها خێزانداره و سێ منداڵی هەیە، تابڵێی پیاوێکی ڕووخۆش و دەم بەپێکەنینە.. جگە لە قورئان خوێندن وتاربێژو مامۆستای قوتابخانەیە، بۆنموونە:

له سالّی ١٩٩٦ تاوەکو سالّی ٢٠٠٢ کراوەتە سەرپەرشتیاری پەروەردە لە قوتابخانە ئایینیەکان.

سەرپەرشتیاری گشتییە لە بنکەی ئیمام شاتبی بۆ قورئانی پیرۆز لە شاری دەمام.

پێشنوێژو وتارخوێنی مزگەوتی (یوسف بن احمد)ە، لە شاری دەمام، ئێستاکەش بەڕێوەبەری گشتی قوتابخانەی (محمد الفاتح)ە، لە شاری دەمام.

**لە بلاّوکراوەکانی:**

خەتمێکی قورئانی پیرۆز کە لە سالّی ١٩٩٦ تۆمارکراوە.

تنظیم الفیة العراقي للحفظ العراقي. رسالة الی أهل القرآن. الاذکار. الأرقیة الشرعیة. کە ئەمانە سەرجەمیان کتێبن و بەچاپ گەیەنراون.



## سعود ابراهيم الشريم

ناوی تەواوی (سعود ابراهیم محمد ئال شریم)ە، و لە سالّی ١٩٦٦ ی زایینی لە شاری ریاز هاتۆتە دنیاوە.. لە سالّی ١٩٨٤ کۆلێژی (اصول الدین)ی لە زانکۆی (ئیمام محمد کوڕی سعود) تەواو کردووەو پاشان لە سالّی ١٩٨٩ کۆلێژی شەریعەی تەواوکردووەو لە سالّی ١٩٩٠ چۆتە پەیمانگای بالاّی ئیسلامیی و لە سالّی ١٩٩٤ ماستەرنامەی وەدەست هێناوە.ئەو ئەرکانەی کە شێخ سعود پێی هەلّساوە:

لە سالّی ١٤١٢ی کۆچی بەرامبەر١٩٩٣ کراوەتە ئیمام و خەتیبی مزگەوتی (الحرام).

لە سالّی ١٩٩٤ کراوەتە دادوەری یەکەمی دادگای بالاّی مەککەی موکەڕڕەمە.

له ساڵی ١٩٩٥ بۆته مامۆستا و وانەبێژ لـه مزگـەوتی (الحـرام) ی مەککەی پیرۆز.

لــه ســاڵی ١٩٩٧ پلــەی دکتــۆرای لــه زانکــۆی (ام القــری) وەرگرتووه، لەنامەیەك لەژێر ناوی (ألسالك ق المناسك).




وێنەی قورئان خوێن لەکاتی قیام الليل ١٤٢٧ هـ



## ﴿ مشاری راشد العفاسی ﴾

نـــاوی تـــەواوی (مەشـــاری ڕاشـــد غـــەریب محەممـــەد ڕاشـــد عەفاسی)یە، لە ساڵی ١٩٧٦ لە دەوڵەتی کوێت لـەدایك بـووە و خێزانی پێکهێناوەو باوکی دوو کچە هەروەها بـە (بـاوکی نـوڕا) ناسراوە.کۆلێژی قورئانی پیرۆز و دیراساتی ئیسلامیی لە شاری (نەبەوی) تەواو کردووە و هەموو جۆرەکـانی خوێنـدنی قورئـان دەزانێـــت.. واتـــە بـــە هـــەموو ڕیوایەتـــەکان.هـــەروەها بـــە قورئانخوێنان (محمود خلیل الحصری و محمد صدیق المنشاوی و مـــستەفا ئیـــسماعیل و عەبدولباســـیت) سەرســـامەو هـــەموو قورئـــانی پیرۆزیـــشی لەبـــەرکردووەو کـــەناڵێکی ئاسمـــانی تەلـــەفزیۆنی تایبـــەت بـــەخۆی هەیـــە کەتێیـــدا قورئـــان و سروودەکانی خۆی و سرودی تری ئیمـانی و وێردەکـان پـەخش دەکات. کە کەناڵەکەشی هەر بەناوی (العفاسی) یە.



## ❁ أحمد بن علي ألعجمي ❁

لـەدایك بـووی ١٩٦٨/٢/٢٤ ی شـاری ( ریـاز ) ی پایتـەختی سعودیەیە ، خێزانداره‌و پێنج منالّی هەیەبەناوەکانی ( عبدالله و عمـر و فاطمـة و مـریم و موضـي ) .دەرچـووی زانكـۆی ئیمـام محەممـەدی كـوڕی سـعوده ، هـەڵگری بڕوانامـەی ماسـتەره لـەزانكۆی ( لاهـور ) ی وڵاتـی پاكـستان ، نـاوبراو خـاوەنی چەندین كتێب و وتاره.. هەروەهالەساڵی ١٩٩٥ لـەكاتی نوێـژی تەراویح خەتمێكی قورئانی بۆتۆماركراوە..

# بەشی دووەمی

# ژیانی قورئان خوێنان

بەرواری وەرگێڕان : مانگی شوباتی ٢٠٠٧



## کورتەیەك لەژیانی قورئان خوێنەناودارەکانی وڵاتی میسر :

* **شێخ عەلی مەحمود** : ساڵی ١٨٧٨ لەقاهیرە لەدایك بووەو لەتەمەنی منداڵیدا چاوەکانی لەدەستداوە، لەگەڵ کردنەوەی ئێزگەی میسر چۆتە ڕادیۆکە و قورئانی خوێندووە . سەبارەت بەمردنی دووبۆچوونی جیاواز هەیە، یەکەمیان گوایە ساڵی ١٩٤١ مردووە و دووەمیان گوایە ساڵی ١٩٤٣ مردووە و تائێستاش لەگەڵدابێ مێژوو و بەرواری مردنی ڕوون نەبۆتەوە . ناوبراو بەبەناوبانگترین مەقام بێژ و سروودبێژ دادەنرێت کەلەلوتکەدا بووە .

* **شێخ محەممەد سەیفی** : ساڵی ١٨٨٥ لە گوندی ( بەرادعە)ی قەیلوبیە لەدایك بوە. هەر لە منداڵیەوە قورئانی پیرۆزی لەبەرکردوە . لە زانکۆی ئەزهەریش خوێندویەتی، بە هەمو شێوازەکانی خوێندنەوە قورئانی خوێندوە .

لە ساڵی ١٩١١ ز لە زانکۆی ئەزهەر پلەی زانایەتی پێ بەخشراوە . لە ساڵی ١٩٣٤ چۆتە رادیۆی میسری و قورئانی خوێندووە . سەرۆکی یەکگرتوی قورئان خوێنان بوە . لە چلە

کان لە مزگەوتی فاتمەی نەبەوی قورئانی خوێندوە . لـە سـاڵی ١٩٤٩ بەدواوە لە مزگـەوتی ئیمـام حـسین لـە قـاهیرە قورئـانی خوێندووە، لە ١٩٥٥ ز مردوە .

* **شێخ عەلی حەزین :** لە ساڵی ١٩٠٢ لە دەورو بەری قاهیرە لە دایـك بـوە. لـە تەمـەنی ١٠ سـاڵاندا خوێنـدنی دواناوەنـدی لـە ئەزهەر تەواو کـردوە، لـە ١٨ سـاڵان لـە کـۆڕ و کۆبوونـەوەکان دەستی کردووە بە قورئان خوێندن لەگـەڵ کردنـەوەی رادیـۆی میـسر لـە سـاڵی ١٩٣٤ چـۆتە رادیۆکـەو قورئـانی خوێنـدوە. رادیـۆی رۆژ هـەڵاتی ئەوپـەڕ بـەدەنگی شـێخ عـەلی حـەزین کراوەتەوە. لە ساڵی ١٩٧٠ ز کۆچی دوایی کردوە.

* **شـێخ محەممـەد عەکاشـە** : لـە سـاڵی ١٨٨٢ لـە ناوچـەی منیرەی قاهیرە لە دایك بـوە، لـە سـاڵی ١٩٣٤ چـۆتە ئێزگـەی میسری و قورئانی خوێندوە. قوتابی شێخ ئەحمەد نـەدا بـووە. یەکێك لـە شـەقامەکانی قـاهیرە بـە نـاوی شـێخ محمـد عکاشـە کـراوە ئەمـەش وەکـو رێـز لێنانێك . چـەندین کـەس خـەڵاتیان کردوە وەك سەعد زەغلول. شـێخ عەکاشـە لەسـاڵی ١٩٨٢ ز کۆچی دوایی کردوە.

* **شـێخ عەبـدولڕەحمان دەروی** : سـالّی ١٩٠٣ ز لـە گونـدی دەروە لە پارێزگەی ( منوفیە ) لە دایك بوە، سالّی ١٩٤٠ چۆتە رادیۆی میسری و قورئانی خوێندووە.
لـە ١٩٥٣ ز دوو هـەینی لـە دوای یـەك لـە مزگـەوتی ئەقـسا لـە فەلەسـتین قورئـانی خوێنـدووە، تـا سـالّی ١٩٨٢ ز لـە قورئـان خوێندن بەردەوام بووە. نزیکەی ( ١٠٠ ) کاسـێتی تۆمـارکراوی هەیـە. ئێزگـەی دەنگـی قورئـان لـە سـعودیە بـە دەنگـی شـێخ عبدالرحمن کراوەتەوە. لە مزگەوتی خازنداری پارێزگەی (شبرا) قورئان خوێن خوێن بووە. سالّی ١٩٩٢ کۆچی دوایی کردوە .

* **شـێخ مەنـسور ئەلـشامی**: لـە سـالّی ١٩٠٦ لـە دەمنهـوری پارێزگـەی بوحـەیرە لـە دایـك بـووە. لـە تەمـەنی ١٠ سـالآن توانیویەتی هەمووقورئانی پیرۆز لەسەردەستی شـێخ ئەحمـەد غەزال لەبەربکات، پاشـان بـەرەو شـاری تـەنتا کۆچـی کـردووە بۆئـەوەی باشـترو زیـاتر فێـری جۆرەکـانی خوێنـدن ببێـت، بەسەرۆکی کۆمەڵەی پارێزگاری لە قورئـان و سـەرۆکی قورئـان خوێنانی ئەسکەندەرییە دەست نیشان کراوە ، لەسـالّی ١٩٤٥

چۆته ئێژگەی میسر و قورئانی خوێندووه . ئەم قورئان خوێنه لەساڵی ١٩٥٩ ی زایینی کۆچی دوایی کردووه .

- **شێخ محەممەد سەلامە** : یەکێکە لەقورئان خوێنە هەرەمەزن و ناودارەکانی میسر ، زۆربەی قورئان خوێنان لەسەردەستی ئەو فێری چۆنیەتی قورئان خوێندن بوون وەکو گەورە قورئان خوێنی جیهانی ئیسلامیی محەممەد سدیق ئەلمەنشاوی، لەساڵی ١٨٩٩ لەشاری قەلیوبیەی وڵاتی میسر لەدایك بووە، لەتەمەنێکی زۆر گەورەدا ڕووی لەئێزگەی میسر کردووەو قورئانی خوێندووە، بەڵام زۆربەکەمی ڕووی لەئێزگە دەکرد و بەبەردەوامی هاتووچۆی مزگەوتی دەکرد ، قورئان خوێن لەساڵی ١٩٨٢ ی زایینی کۆچی دوایی کردووە .
- **شێخ عەبدولعەزیم زاهیر**: لەساڵی ١٩٠٤ ی زایینی لەگوندی (مجول ) ی سەربەپارێزگای قەلیوبیەی میسر لەدایك بووە ، ساڵی ١٩٣٦ چۆتەئێزگەی میسرو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ قورئانی خوێندووە ، لەساڵی ١٩٦٨ ی زایینی چۆتەبەڕەحمەتی خودای میهرەبان و کۆچی دوایی کردووە .

- **شـێخ ئەحمـەد سـولەیمان سـەعدەنی** : لەسـاڵی ١٩٠٧ ی زایینی لە پارێزگـای شـەرقیە لـەدایك بـووەو بـۆ یەكـەمجار لەساڵی ١٩٣٦ چـۆتەڕادیۆی میسر و قورئـانی خوێنـدووە. كتێبێكـی دەربـارەی ژیـانی قورئـان خوێنـە ناودارەكـانی جیهـانی ئیـسلامیی نووسـیوە و بـە چـاپی گەیانـدووە ، لەساڵی ١٩٧٦ كۆچی دوایی كردووە .
- **شێخ تەها ئەلفشنی** : لەساڵی ١٩٠٠ ی زاییـنی لـەپارێزگای بـەنی سـوێف لـەدایك بـووە، سـاڵی ١٩٣٧ چـۆتە ئێزگـەی میـسر و قورئـانی تێـدا خوێنـدووە، لـەدوای شـێخ عـەلی مەحمود بەباشترین مەقام خوێن و سروود بێـژ دادەنرێـت ، هـەروەها بەهـەمان شـێوە لـەدوای شـێخ عـەلی مـەحمود لەهونـەری سـتایش و پاڕانـەوە ڕۆڵـی بەرچـاوی هـەبووە . شـێخ تـەها ئەلفـشنی لەسـاڵی ١٩٤٠ ی زاییـنی چـۆتە مزگـەوتی سـەكینە خـانم و قورئـانی خوێنـدووە، لەسـاڵی ١٩٧١ ی زایینیش كۆچی دوایی كردووە...
- **شێخ محەممەد فەرید سەندیونی** : لەساڵی ١٩٠٢ ی زاییـنی لەگوندی سەندیونی سەربەشاری ئەلمەنوفیە لەدایك بووە ،

ناوی تەوای خۆی ( عبدالعظيم السمنی ) ە، لەتافی لاوێتیدا چۆتەئێزگەی میسر و قورئانی خوێندووەو پاشان چۆتە ڕادیۆی فەلەستین و چەند کاسێتێکی بۆ تۆمارکراوە، قورئان خوێن لەساڵی ١٩٥٥ ی زایینی لەشاری شبرا ماڵئاوایی لە دنیا کردووە .

- **شێخ مەحمود عەبدولحەکەم** : لەساڵی ١٩١٥ ی زایینی لەگوندی ( کرنك ) ی سەربەناوچەی ( ابو تشت ) هاتۆتە دنیاوە و تەمەنی لەبیست ساڵان تێپەڕیوە بەقورئان خوێن لە مزگەوتی ( سیدە نفیسە ) دامەزراوەو تاوەکو کۆچی دوایی کرد هەرلەومزگەوتە بەقورئان خوێن مایەوە.
- **شێخ عەبدولعەزیز عەلی فەرەج** : لەساڵی ١٩٢٧ ی زایینی لە ناوچەی ( میت واسط ) ی سەربەشاری مەنوفیە لەدایك بووە ، لەلای شێخ ئەحمەد ئەشمونی فێری خوێندنی قورئان بووە و لەساڵی ١٩٦٢ ی زایینی چۆتە ئێزگە، لەبەرواری ١٩٧٧/٣/١٧ کۆچی دوایی کردووە .
- **شێخ محەممەد حەسەن ئەلنەدا** : کەسێکی دەنگ خۆش و مەقام زانێکی کارامەیە، لەتەمەنێکی زوودا پەیوەندی بە ئێزگەی میسرەوە کردووەوچەندین کاسێتی موناجات و

قورئـانی بۆتۆمـارکراوە ، لەسـاڵی ١٩٢١ لـەقاهیرە لـەدایك بـووەو لەتەمـەنی چـل سـاڵان واتـا لەسـاڵی ١٩٦١ کۆچـی دوایی کردووە .

- **شـێخ ئیـبراهیم ئەلمەنـسوری** : لەسـاڵی ١٩٢١ لەشـاری ئەسـکەندەرییە لەبنەماڵەیـەکی ئیمانـدارو هـەزار چـاوی هەڵهێناوە ، تەمەنی گەیشتۆتە یانزە ساڵان هەموو قورئانی لەبەر کردووە، لەساڵی ١٩٥٤ چۆتە ئێزگە و تیایدا قورئـانی خوێنـدووە و ئێزگـەی ئەسـکەندەرییەش بـەدەنگی ئـەو کراوەتەوە، لەسەرەتای ساڵی ١٩٤٠ ی زایینی لە مزگـەوتی محەممەد عەلی دامەزراوە پاشان لەمزگـەوتی سـەیدی جـابر لەئەسـکەندەرییە بۆتـە قورئـان خـوێن . قورئـان خـوێن لەبەرواری ١٩٨٨/٦/٧ ی زایینی کۆچی دوایی کردووە .
- **شێخ عـەوەزێن ئەلـەغریبی** : لەساڵی ١٩٢١ ی زایینـی لـە شـاری دەقهەلیـەی وڵات میـسر هاتۆتـە دنیـاوە و پاشـان ڕووی کردۆتـە شـاری تـەنتا و لـەوێ لـەلای شـێخ ئیـبراهیم سەلام ئەلمالیکی فێـری خوێنـدنی قورئـان بـووە ، لەسـاڵی ١٩٥٢ پەیوەندی بە ئێزگە کردووەو لەبـەرواری ١٩٩٢/٩/١١ ی زایینی کۆچی دوایی کردووە .

- **شێخ محەممەد عیمران** : قورئان خوێن و مەقام زانی بەناوبانگ لەساڵی ١٩٤٤ لەدایك بووەو لەساڵی ١٩٩٤ کۆچی دوایی کردووە .
- **شێخ هاشم مەحمود هیبە** : لەساڵی ١٩١٧ ی زایینی لەشاری قەلیوبیە لەدایك بووەو بۆ یەکەمجار لەساڵی ١٩٥٣ ی زایینی لە ئێزگە قورئانی خوێندووە، لەسەرەتای شەستەکان بۆتە سەرۆکی شاندی ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامیی لەوڵاتی مالیزیا، قورئان خوێن لەبەرواری ١٩٨٥/١/٢٩ کۆچی دوایی کردووە..
- **شێخ ڕزق خەلیل حەببە** : لەساڵی ١٩١٩ لەگوندی کەفر سولەیمانی وڵاتی میسر هاتۆتە دنیاوە، لەپەنجاکان پەیوەندی بەئێزگەوەکردووەو ماوەیەکیش بۆتە گەورەی قورئان خوێنانی وڵاتی میسر، خوالێخۆشبوو لەبەرواری ٢٠٠٤/٥/٢٧ ی، زایینی کۆچی دوایی کردووە .
- **شێخ نەسرەددین تۆباڕ** : لەشاری دەقهەلیەی میسر لەساڵی ١٩٢٠ لەدایك بووەو لەساڵی ١٩٥٦ چۆتەئێزگە و قورئانی خوێندووە، و جگە لەقورئان خوێندن چەندین موناجات و

مەقاماتی بۆ تۆمارکراوە، لەبەرواری ١٩٨٦/١١/١٨ کۆچی دوایی کردووە .

- **شێخ محەممەد ساعی نەسر ئەلجرزاوی** : لەساڵی ١٩١٢ ی زایینی لەناوچەی جرزای سەربەشاری ئەلجیزە لەدایك بووە، لەساڵی ١٩٦٢ پەیوەندی بەئێزگەی میسرییەوە کردووە، و پاشان بۆتە قورئان خوێن لەمزگەوتی زەمالیك تا لەدنیا دەرچوونی، قورئان خوێن لەبەرواری ١٩٨٤/٥/٩ کۆچی دویی کردووە .

- **شێخ محەممەد عەبدولعەزیز حیسان** : لەساڵی ١٩٢٨ لەگوندی کەفر زەیات لەدایك بووەو بەمامۆستای خێرخوازوکۆمەك بەخش ناوبانگی دەرکردبوو، لەساڵی ١٩٦٤ پەیوەندی بەئێزگە کردووەو لەبەرواری ٢٠٠٣/٣/٣ ی زایینی کۆچی دوایی کردووە .
- **شێخ ئیبراهیم ئەلشەعشاعی** : کوڕی قورئان خوێنی ناودار عەبدولفەتاح شەعشاعییە و لەساڵی ١٩٣٠ زایینی لەقاهیرەی پایتەخت لەدایك بووە و لەساڵی ١٩٦٧ پەیوەندی بە ئێزگەوە کردووەو بەفەرمانی وەزارەتی

ئـەوقاف لەمزگـەوتی سـەیدە زەینـەب بـەقورئان خـوێن دامـــــەزراوە، لەبـــــەرواری ١٩٩٢/٦/٩ ی زایینــــــی بەنەخۆشییەکی کت و پڕ گیانی لەدەستدا.

- **شێخ عەلی حـەججاج ئەلسوسی** : لەساڵی ١٩٢٦ لەشاری قاهیرە هاتۆتە دنیاوە ولەناوەڕاستی شەستەکان پەیوەندی بـە ئێزگـە کـردووەو پـاش تاقیکردنـەوەی دەنگـی نمـرەی زۆرباشـەی مـسۆگەرکردووە، لەبـەرواری ٢٠٠٢/٩/٩ کۆچـی دوایی کردووە .
- **شـێخ ئەحمـەد ئـەلڕزەیقی** : لەســاڵی ١٩٣٨ لەشـاری رزەیقاتی میسر هاتۆتە دنیاوە و لەسـاڵی ١٩٧٥ پەیوەنـدی بـەڕادیۆ و تەلـەفزیۆنی میـسرییەوە کـردووە، لەبـەرواری ٢٠٠٥/١٢/٨ کۆچی دوایی کردووە .
- **شێخ فەتحی محەممەد قەندیل** : لەسـاڵی ١٩٣١ لەشـاری مەنوفیە لەدایك بووەو لەلای باوکی فێری خوێندنی قورئـان بووە، هەروەها دەرچووی زانکـۆی ئەزهـەرە بەشـی زمـانی عـەرەبی، لەسـەرەتای حـەفتاکان پەیوەنـدی بـە ئێزگـەوە کـردووەو لەبـەرواری ١٩٩٠/٧/٦ ی زایینـی ئـەمری خـودای بەجێهێناوەو کۆچی دوایی کردووە .

- **شێخ حەمدی مەحمود ئەلزامیل** : لەسالّی ١٩٢٩ ی زایینی لەناوچەی مەنسورەی سەر بەشاری دەقهلیە لەدایك بووەو ، لەسالّی ١٩٧٥ پەیوەندی بەئێزگەوە کردووەو لەسالّی ١٩٨٢ ی زایینی کۆچی دوایی کردووە.
- **شێخ مەحمود حوسێن مەنسور** : لەسالّی ١٩٣٤ ی زایینی لەشاری قاهیرە هاتۆتە دنیاوەولەسالّی ١٩٦٣ چۆتە ئێزگە و بۆتە قورئان خوێن ، خوالێخۆشبوو لەبەرواری ٢/٩/٢٠٠٢ ی زایینی کۆچی دوایی کردووە .



﴿ شێخ محمد محمود الطبلاوي ﴾

نەقیبی قورئان خوێنانی وڵاتی میسر، لەبـەرواری ١٩٣٤/١١/١٤ لەگوندی ( میت عقبە ) ی سەربەشـــــــاری ( جیـزە ) لـەدایك بـووە، لەتەمـــەنی چوارســاڵان بــاوکی بردوویەتیــە مزگـــەوتی گوندەکەی و، تەمەنی گەیـشتۆتە ( ١٠ ) سـاڵان هـەمووقورئانی بە پوختی و ڕەوانی لەبەرکردووە.تەبلاوی دەڵـێ: هــەمووکاتێك بەتایبەتی تر لەدوای نوێژەکان باوکم دەستی نزای بـۆ ئاسمـان بەرز دەکردەوە کەیەکێ لـە کوڕەکـانی ببێتـە قورئـان خـوێن و خزمــەتکاری قورئــانی پــیرۆز . هــەروەهادەڵێ نزاکــانی بــاوکم گیرابـوون و مـن بـووم بـە قورئـان خـوێن و قوتـابی پیرۆزتـرین کتێب کە ئەویش قورئانی پیرۆزە ..

قورئـان خـوێن تەمـەنی گەیشتە چـواردە سـاڵان دەسـتی کـرد بــەقورئان خوێنــدن لــە مزگـەوت و ئاهەنگـەکان و پرســەکان، ئەوەی زیاتر تەبلاوی هاندا بـۆ بـەردەوام بـوون لەسـەر قورئـان

خوێندن، وتەکانی مامۆستای یەکەمی بوو کەپێ ووت : ئەی محەممەد تۆکەسێکی بەهێزی و دەنگت زۆر خۆش و پڕ کاریگەرە و ەردەوام بە لە خوێندنی قورئان .تەبلاوی لەسالّی ١٩٧٥ بۆماوەی ( ١٠ ) جار لەدوای یەکتر سەردانی ئێزگەی کردو پاش تاقیکردنەوەیەکی زۆر لەلایەن پسپۆڕانی بواری مۆسیقاو دەنگ توانی پلەی زۆرباشە بۆخۆی مسۆگەربکات و توانی ببێتە قورئان خوێنی ئێزگەکان .

**هەروەها لەژیانیدا ئەم کارانەی پێ سپێردراوە :**

سەرۆکی هەموو قورئان خوێنانی میسر.

ئەندامی ئەنجوومەنی بالآی کاروباری ئیسلامیی .

ڕاویژکاری کاروباری ئایینی لەوەزارەتی ئەوقاف .

ئێستاکەش نەقیبی قورئان خوێنانی میسرە .

شێخ تەبلاوی تائێستاکەش لەژیانداماوەو دەنگێکی فرە خۆشی هەیە ، هەروەها توانیویەتی دوو جۆر خەتمی قورئان تۆمار بکات یەکێکیان بەشێوەی تیلاوە و ئەوەی تریان بە شێوەی تەرتیل . وەلەژیانیدا سەردانی هەشتا ولآتی ئەوروپی و ئەفریقی و ئاسیایی کردووەو لەو ولآتانە ئاهەنگەکانی شەوی قەدرو پێشبڕکێکانی بەرز ڕاگرتووە .بەتایبەتی تر شانازی

بەگەشتەکەی دەکات بۆ هەریەک لە یۆنان و ئیتاڵیا کەلەمیانەیدا توانیویەتی بەرامبەر خەڵکێکی زۆری ئەو دوو وڵاتە بەموسڵمان و غەیرە موسڵمان قورئان بخوێنێ و کاریگەرییان لێ بکات .



**قورئان خوێن لەستۆدیۆی تەلەفزیۆنی میسر سەرەتای هەشتاکان**



**محمدالطبلاوي و عبدالفتاح الطاروطي / مصر ٢٠٠٤**



شێخ ﴿ محمد انور الشحات ﴾

کەسێکی وریا و زیرەك و زیتەڵ، کەسێکی نەرم و نیان و ورە بەرز ... خاوەنی دەنگێکی ساف و هەناسە درێژ ، بە توانا لە قورئان خوێندن ، کەسێکی ڕاستگۆ و بێ فیز، هەروەها مەقام زانێکی بەهێزە و لەکاتی خوێندنی قورئان ئەوەندە دەنگێکی بە هێز و بەپێزی هەیە کە دەتوانێ هەموگوێگرێك سەرسوڕمان بکات...

شەحات لەساڵی ١٩٥٠ ی زایینی لە گوندی (کفر الوزیر) ی سەربە پارێزگای دقهلیەی میسر لەبنەماڵەیەکی هەژار و ئیماندار لەدایك بووە، تەمەنی گەیشتۆتە سێ مانگان باوکی کۆچی دوایی کردووە . پاشان خاڵۆی بردوویەتییە لای خۆی و بە جوانترین شێوە لەگەڵ منداڵەکانی خۆی پەروەردەی کردووە ، شەحات تەمەنی گەیشتە هەشت ساڵان

هـەمووقورئانی لەبەرکردووبـەو هۆیـەوە خـالۆی زیـاتر ڕەنجـی لەگــەڵ کێـشا و لەگــەڵ دەبـردە قوتابخانــە ئیـسلامییەکانی گوندەکـــەی تـــاوەکو زیـــاتر فێـــری خوێنـــدنی قورئـــان و ئەحکامـەکانی ببێـت . پاشـان بردییـە لای شـێخ عـەلی سـەید ئەحمـەد و لەڕێگـەی نـاوبراو بەتـەواوەتی فێـری زانـستەکانی تەجوید بوو.

لەساڵی ١٩٦٥ لە پرسەیەك قورئـانی خوێنـد و تـوانی سـەرنجی زۆربـەی قورئـان خوێنـە گـەورەکان و ئامـادەبووان بـۆ خـۆی ڕابکێشێ !

لەســاڵی ١٩٧٠ کەتەمــەنی بیــست ســاڵان بــوو بەیــەکجاری ناوبـانگی دەرکـرد کەزۆربــەی خــەڵکی لەپرســەکان ئـامێری تۆمارکـەریان لەگـەڵ خۆیـان دەهێنـا و دەنگـە بەسـۆزەکەیان تۆماردەکرد . تاوای لێهات ئێزگەی میسر بە دەنگە خۆشەکەی زانـــی و لەســـەرداوای بەڕێوەبـــەری ڕادیۆکـــە چـــەند کورتـــە ســـورەتێکی قورئـــانی پـــیرۆزی تۆمـــارکرد کەلەبـــەرواری ١٩٧٨/١٢/١٦ دابـوو لەسـاڵی ١٩٨٤ بەیـەکجارەکی ناوبـانگی دەرکـردوو لەسـەرجەم پارێزگاکـان بانگهێشتی ئاهەنگـەکانی قورئان دەکرا .قورئـان خـوێن مـاوەی زیـاتر لـە بیـست و دوو

ساڵە سەردانی چەندین وڵاتی وەك ئیمارات و ئوردن و كوێت و مالیزیا و ئێران و باشووری ئەفریقیا دەكات بۆ خوێندنی قورئانی پیرۆز و بەرزڕاگرتنی بۆنە ئایینیەكان و چەندین كاسێتی تۆماركراوی دەنگی و ڕەنگی هەیە و سەدان قوتابیشی فێری خوێندنی قورئان كردووە، لەبەرواری ٢٠٠٨/١/١٤ ئەمری خوای گەورەی بەجێ هێناو ماڵئاوایی لەدنیای فانی كرد.



## ﴿ دکتۆر ئەحمەد نوعەینەع ﴾

لەشاری مەتوبسی سەربەپارێزگای کەفر ئەلشێخی میسر هاتۆتە دنیاوە ،هەرلەتەمەنی هەرزەکاریدا زۆر بەجوانی لاسایی قورئان خوێنان ( محمد رفعت و مصطفى اسماعيل و ابوالعينين ) کردۆتەوە و بەبەردەوامی ڕادیۆیەکی بەدەستەوەبووە ، بۆیەکەمجار لەناوەڕاستی شەستەکان قورئان خوێن ( مصطفى اسماعيل ) سەردانی گوندەکەیان دەکات و لەپرسەیەك قورئان دەخوێنێ، ئەحمەدی گەنجیش لەتەك قورئان خوێن دادەنیشێت و بەدەنگێکی فرە خۆش قورئان دەخوێنێ ، پاشان شێخ مصطفى زۆر دەستخۆشی لێدەکات و گەلێك هانی دەدات . ئەحمەد نەعەینەع لەتەمەنی هەژدە سالآن پەیوەندی بەکۆلێژی پزیشکییەوە دەکات بەسەرکەوتوویی قۆناغەکانی دەبڕێت ، تاوەکو چاکترین پزیشکی بواری نەشتەرگەری لێدەردەچێت .. بەلآم

دەستبەرداری خوێندنی قورئانی پیرۆزنابێت و اه خوێندنەوەی بەردەوام دەبێت، تا ئەو کاتەی باشترین و دەنگ زولاڵ ترین قورئان خوێنی لێدەردەچێت .لەساڵی ١٩٦٧ دوای تەواو کردنی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی ئەسکەندەرییە بەپلەی مولازمی یەکەم لە سوپای میسر دادەمەزرێت لەوساڵەدالەنێو سوپای بەیەکجارەکی ناوبانگێتی ئەحمەد دەناسرێت بەتایبەتی تر لەکاتی پشوو لەگۆڕەپان بۆ سەربازەکان قورئان دەخوێنێت .دکتۆر ئەحمەد نوعەینەع ئەمڕۆکە بۆتە یەکێك لەقورئان خوێنە ناودارەکانی جیهانی ئیسلامیی سەرەڕای کاری پزیشکی لەگەڵ قورئان خوێندن و فێرکردنی خەڵکانی تر بەردەوامە . لەماوەی ژیانیدا سەردانی ئەم ولاَتانەی جیهانی کردووە .

- مالیزیا ١٩٧٩ لەپێشبڕکێیەك پلەی یەکەم قورئان خوێنی پیَ بەخشرا .
- هیندستان ١٩٨٥ جارێکی دیکە پلەی یەکەمی لە ئاهەنگێك وەدەست هێنا .
- مالیزیا ١٩٩٥ پلەی یەکەم لەسەرئاستی قورئان خوێنەکانی جیهانی ئیسلامیی .

- هەروەها سەردانی ئەم وڵاتانەی کردووە ( ئەمریکا ، ئەندنوسیا ، برۆنای ،پاکستان ، کەنەدا و چەندین وڵاتی ئەوروپی …

قورئان خوێن لەژیاندامەوە خەتمێکی قورئانی پیرۆزی بۆ تۆمارکراوە بەڕیوایەتی ( حفص عن عاصم ) لەگەڵ زیاتر لە پەنجا کاسێتی نێو ئاهەنگەکان بە دەنگ و ڕەنگەوە .



## ﴿ دكتور عبدالفتاح الطاروطي ﴾

لـــــه ٢٩/٤/ ١٩٦٥ ی زایینــــــی لەناوچــــــەی ( زقـــــازیق ) سەربەشــــاری ( طاروط ) ی پارێزگای غـەربی لەبنەماڵەیـەکی دینـدار و هـەژار لـەدایك بـووە وبـەباوکی ئەحمـەد ناسـراوە، تەمـەنی نەگەیـشتۆتە چـوار سـاڵان هەشـت جزمـی قورئـانی پیرۆزی لەبەرکردووە. هەمووهیوا و ئاواتێکی باوکی ئەوە بـووە کە عەبدولفەتاح ببێتـە قورئـان خـوێن و لـە گوندەکـەی خۆیـان ناسـراو بێـت، قورئـان خـوێن لەسـاڵی ١٩٨٦ چـۆتە زانکـۆی ئەزهـەرو لەسـاڵی ١٩٩٠ کۆلێـژی ئـسولی دیـن بەشـی زانـستە ئیسلامییەکانی تەواوکردووە.

لەســـەرەتای چـــوونی بۆزانکـــۆ هـــەمووڕۆژێك لەســـەر داوای مامۆسـتاکانی ئەزهـەر لـەگۆڕەپانی زانکـۆ بـەدەنگێکی بـەرز و فرەخۆش قورئانی خوێندووە، ناوبراو لەژیانیدا ڕێچکەی قورئان خوێنان ( محمد رفعت و محمد صديق المنشاوی ) گرتووە.

شێخ عەبدولفەتاح زۆر خۆی بەقەرزاری باوکی و شێخ نەجارِ دەزانێ چونکە هەولّی زۆریان لەگەڵداوە . شێخ عەبدولفەتاح جگە لە قورئان خوێندن وتاربێژێکی کارامەی میسرییە، هەروەها ڕۆژانە لەنێو مزگەوتەکەی سەدان قوتابی فێری قورئان خوێندن دەکات و بانگخوازێکی ناوداری میسریشە و سایتێکی ئینتەرنێتی تایبەت بە خۆی هەیە . لەساڵی ۱۹۹۷ چۆتە شاری سان فرانسیسکۆی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکاو لەهەولّێکدا توانی شەش پیاوو چوار ئافرەتی ئەمریکی بکات بە موسڵمان وە لەساڵی ۲۰۰۱ لەسەربانگهێشتی زانکۆی ئیسلامیی پاکستانی لە کەراتشی بۆتە قوتابی زانکۆکەو لەساڵی ۲۰۰۳ بەرامبەر سەدو پەنجا هەزار کەس بڕوانامەی دکتۆرای وەدەست هێنا، جگە لەوەی یاریزانێکی هەرەباشی یاری تۆپی پێیە، وە براکەیشی بەناوی شێخ محەممەد قورئان خوێنە و دەنگێکی ئێجگار خۆشی هەیە .

# بەشی سێ یەم

# ژیانی قورئان خوێنان

**بەرواری وەرگێڕان مانگی تەمموزی ۲۰۰۸**



# بەشی سێیەم:

- عبدالله الخياط
- ماهر المعيقلي.
- عادل الكلباني
- توفيق الصائغ.
- عبدالله الجهني.
- شيرزاد عبدالرحمن
- هانى الرفاعي
- محمود القاريء
- محمد ايوب
- علي عبدالله جابر
- صلاح بوخاطر
- عبدالعزيز الاحمد
- العيون الكوشي
- عبدالباري الثبيتي
- إبراهيم الاخضر
- صلاح محمد البدير
- حافظ خليل اسماعيل
- عبداللطيف العبدلي
- نعمه الحســــــان



## ﴿ عەبدوڵلا خەیات ﴾

گەورەی قورئان خوێنانی ولاّتی سعودیە لەساڵی ١٩٠٦ ی زایینی بەرامبەر بە ٢٩ی شەوالی ساڵی ١٣٢٦ ی کۆچی لەشاری مەدینەی پیرۆز لەدایك بووە، تابڵێی دەنگێکی خۆشی هەیە و دڵەکان دەهەژێنێت و زۆربەی زانایانی ولاّتەکەی لەبارەیەوە وتویانە (أوتي علماً نافعاً وصوتاً حسناً عذباً جميلاً، لا تكلف في قراءته ولا تقليد في خطبه. التزم المسجد الحرام مدة من الزمن إماماً وخطيباً، متع المصلين بجمال صوته وبلاغة خطبه، إنه حقاً وحقيقة الإمام والخطيب المثالي، خفيف في صلاته يلدغ في خطبه، محبوب عند الناس ) هەروەها (هو الباكي والخاشع إذا قرأ وصلى، فأبكى الناس وأشجاهم خشوعاً. هذا هو شيخنا صاحب مزايا متعددة قارىء معروف وخطيب مفوه وكاتب اجتماعي سهل ممتع، إمام أكبر بقعة على وجه الأرض ...!!!!).

لەتەمـــەنی شـــەش ســالآن بــۆ خوێنــدنی ســـەرەتایی چـوّتە قوتابخانەی ( خیاگ ) و بۆ خوێندنی ناوەندیش رووی کردۆتـە قوتابخانەی ( الراقیە ) لەسەردەمی حوکمی هاشمی.

پاشان چۆتە مزگەوتی حەرام و لەویٚ فێری زانستەکانی قورئان بووە، و لەساڵی ۱۳٦۰ ی کۆچیش چۆتە پەیمانگای زانستی ئیـسلامیی لەمەککــە و بروانامـــەی بەپلـــەی نایـــاب پـــیٚ بەخشراوە...

لەژیانیــدا لەلایــەن ئــەو کۆمەڵــە مامۆســتایە ناودارانـــەی سەردەمەکەی وانەی ئیسلامیی خوێندووە:

- الشیخ عبدالله بن حسن آل الشیخ رئیس القضاة في الحجاز (وقدلازمـــــــــــه قرابـــــــــة عـــــــــشر ســـــــــــنوات)

- الشیخ عبدالظاهر محمد أبوالسمح إمام وخطیب المسجد الحـــــــــرام والمـــــــــــدرس فیـــــــــه .

- الشیخ محمد عبدالرزاق حمزة إمام وخطیب المسجد النبوي والمـــــــــــدرس فیـــــــــــه .

- الشیخ أبوبکر خوقیر المدرس بالمسجد الحرام .

- الشیخ عبیدالله السندي المدرس بالمسجد الحرام .

- الشیخ سلیمان الحمدان المدرس بالمسجد الحرام .

ـ الشيخ محمد حامد الفقي المدرس بالمسجد الحرام .

ـ الشيخ المحدث مظهر حسين المدرس بالمسجد الحرام .

ـ الشيخ إبراهيم الشوري مدير المعهد العلمي السعودي والمدرس فيه .

ـ الشيخ محمد عثمان الشاوي المدرس بالمسجد الحرام والمعهد العلمي السعودي .

ـ الشيخ محمد بن علي البيز المدرس بالمعهد العلمي السعودي .

ـ الشيخ بهجت البيطار المدرس في المعهد العلمي السعودي .

ـ الشيخ تقي الدين الهلالي المدرس بالمسجد الحرام والمعهد العلمي السعودي.

ـ الشيخ حسن عرب المدرس بالمدرسة الفخري .

ـ الشيخ محمد إسحاق القاري مدير المدرسة الفخرية والمدرس بها.

بەفەرمانی شا عەبدولعەزیز لەساڵی ١٣٥٦ ی کۆچی بەبەڕێوەبەری قوتابخانەی ( الامراء ) لەمەککە دامەزراوە، و لەساڵی ١٣٧٢ ی کۆچیش بەراوێژکاری خوێندنی باڵا لە شاری

حیجاز دامەزراوە، هەروەها دەیان پۆستی تری پێدراوە وەکو ئەندام لەلێژنەی (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر )....

دوای دووساڵ لەم پۆستانە بۆتە مامۆستا لەکۆلێژی شەریعەی سعودی و سەرپەرشتیاری گشتی خوێندنی باڵا لە مەککەی پیرۆز.

لەساڵی ۱۳۷۳ی کۆچی بەفەرمانی شای سعودیە بەئیمام و خەتیبی مزگەوتی حەرام دەمەزراو ماوەی سی ویەك ساڵ لەم کارەی بەردەوام بوو و دواتر لەساڵی ١٤٠٤ ی کۆچی بەرامبەر بە ساڵی ١٩٨٤ ی زایینی لەسەر داوای خۆی دەسبەرداری ئەوکارە بوو ئەویش بەهۆی ناتەواوی تەندروستییەکەی، هەروەها بەرلەو کارە بووە ئەندامی لێژنەی رۆشنبیری رابیتەی جیهانی ئیسلامیی، و ئەندامی لێژنەی فەتوای هەمان رێکخروای رابیتەی جیهانی ئیسلامی.

لەساڵی ۱۹۷۰ ی زایینیش بەبڕیارێکی وەزارەتی ئەوقافی سعودی بەگەورەترین و نایابترین زانای مەملەکەی عەرەبیی سعودیە هەڵبژێردرا، وچەندین خەڵات و رێزلێنانی پێ بەخشرا... ئەم گەورە قورئان خوێنە لەبەرەبەیانی رۆژی یەك شەممە بەرواری حەوتی شەعبانی ساڵی ١٤١٥ ی کۆچی

بەرامبەر بەساڵی ١٩٩٥ ی زایینی و لەتەمەنی هەشتاو نۆ ساڵان ئـەمری خـوای بـەجێ هێنـاو گیـانی پـیرۆزی سـپارد هـەزاران رەحمەت لەگۆڕەکەی بێت و بـە ئامـادەیی خـەڵکانێکی ئێجگـار زۆر تەرمی لە مەککە بەخاك سپێردرا.

**ئەمەش بەشێکە لەبلاوکراوەکانی**:

( التفسير الميسّر) ثلاثة أجزاء.

الخطب في المسجد الحرام (ستة أجزاء .

دليل المسلم في الاعتقاد، على ضوء الكتاب والسنة .

اعتقاد السلف .

ما يجب أن يعرفه المسلم عن دينه .

حِكم وأحكام من السيرة النبوية .

تأملات في دروب الحق والباطل .

صحائف مطوية .

لمحات من الماضي .

الفضائل الثلاث .

الرواد الثلاث .

على درب الخير .

الربا في ضوء الكتاب والسنة .

الحدود في الإسلام على ضوء الكتاب والسنة .

تحفة المسافر ( أحكام الصلاة والصيام والإحرام في الطائرة .

البراءة من المشركين .

قصة الإيمان .

شخصيات إسلامية .

المصدر الثاني للتشريع الإسلامي .

عندما ينعكس الوضع .

قال لي محدثي .

التربية الاجتماعية في الإسلام .

الخليفة الموهوب .

مبادىء السيرة النبوية .

دروس من التربية الإسلامية .

حركة الإصلاح الديني في القرن الثاني عشر .

هذا بالإضافة إلى مشاركات علمية ودعوية متعددة في مختلف وسائل الإعلام .



## ﴿ ماهربن حمد المعيقلي ﴾

خاوەن دەنگێکی لەڕادەبەدەر خۆش و بەهێز و دڵ هەژێن ئەو دەنگەی زۆربەی بیسەرانی سەرسام کردووە، و خەڵکان لەسەرانسەری جیهان تامەزرۆی دەنگی ئەون و تەمەننا دەکەن خوای گەورە تەمەنیان بدات تاوەکو سەردانی ماڵی خوای گەورە بکەن و لەبەرامبەر کەعبەی پیرۆز ریز ببەستن و لەدوای ئەو قورئان خوێنە نوێژەکانیان بەکۆمەڵ بەجێ بگەیەنن.

ناوی تەواوی ئەم قورئان خوێنە (ماهر بن حمد بن معيقل المعيقلي البلوي )ە، ولەساڵی ١٩٨٢ ی زایینی لەباکووری شاری مەککەی پیرۆز لەدایك بووە و دواتر چوونەتە شاری مەدینە، لەتەمەنێکی زوودا حەز و خولیای چۆتە سەر خوێندنی قورئانی پیرۆز و زانستەکانی قورئان و تەجوید. بەسەرکەوتوویی قۆناغەکانی خوێندنی بڕیوە و تاوەکو لەکۆلێژی مامۆستایان وەردەگیرێت و پاشان دەبێتە مامۆستای

بیرکـاری، دوای تـەواوکردنی قۆناغـەکانی کۆلێـژ بەفـەرمانی وەزارەتی پەروەردە دەنێردرێتە شاری مەککە و لەقوتابخانـەی ( بلاط الشهداء ) بەمامۆستای وانـەی بیرکـاری دادەمـەزرێت، و ئنجـا دەچـێتە قوتابخانـەی دواناوەنـدی ( الامـیر عبدالمجیـد ) بۆوتنەوەی هەمان وانە بەقوتابیانی قوتابخانەکە.

شـێخ مـاهیر خێزانـدارە و دوو کـورِ و دوو کـچی هەیـە و رۆژانـە لەگـەڵ منداڵـەکانی خـەریکی وتنـەوەی وانـەکانی قورئـان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری پێشەوایە سـەلامی خـوای گـەورەی لەسەربێت، لەساڵی ٢٠٠٦ بـە پێـشنوێژخوێنی مزگـــــەوتی ( عبدالرحمن السعدی ) لەگەڕەکی عەوالی شاری مەککە دامەزراوە و پاشان کراوەتە پێشنوێژخوێنی مزگەوتی پێغەمبەر لەمەدینـە لـەاڵی ٢٠٠٧ . بـەبڕیاری ( المقـام الـسامی ) شـێخ مـاهیر کراوەتـە وانەبێـژ لـە کۆلێـژی ئومولقـــورا، و لەهـــەمان کــاتیش لەســاڵی ٢٠٠٧ کــرا بــە پێــشنوێژخوێنی مزگــەوتی ( الحــرام ) ی مەککــەی پــیرۆز و تائێستاش لە پێشنوێژخوێنی لەم مزگەوتە پـیرۆز و گەورەیـەی ســـــەر رووی زەوی بەردەوامـــــە، دواتـــــر لەســـــەر داوای

خۆدەسبەرداری پیشەی مامۆستایەتییەکەی بووە و پەیوەندی بە کۆلێژی ئومولقورا کردووە وبۆتە وانە بێژ لەو کۆلێژە.

شێخ ماهیر هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆسە لەکۆلێژی مامۆستایان و لەهەمان کاتیش خاوەنی ماستەرنامەیە لە فیقهی ئیسلامی.



قورئان خوێن (ماهر المعيقلي)

لە کاتی نوێژی تەراویحی مانگی رەمەزانی ساڵی ٢٠٠٧زایینی

لە مەککەی پیرۆز



## ﴿ ئەبوبەکر ئەلشاتری ﴾

بە ئـەبو عەبـدولڕەحمان ناسـراوە و ، لەسـاڵی ۱۹۷۰ لـە شـاری جەددەی وڵاتی سـعودیە لـەدایك بـووە . لـەم مزگەوتانـە پـێش نوێـژ خـوێنی کـردووە ( مـسجد الراجحـی ، سـعید بـن جـبیر ، عبـداللگیف جمیـل ، التقـوی ، الـشعیبی ) ئێـستاش پێـشنوێژ خوێنـە لـە مزگـەوتی ( الفرقـان ) لەناوچـەی نەسـیمی شـاری جەددە.

خاوەن خەتمێکی قورئانە بەڕیوایەتی ( حفص عن عاصم ) کە لەنوێـژی تـەراویح بـۆی تۆمـارکراوە، لەلایـەن شـێخ ئەیمـەن روشـدی سـوەید مۆڵـەتی قورئـان خوێنـدنی پێـدراوە لەسـەر خوێندنی ( حفص عن عاصم ) لەساڵی ۱۹۹۵ی زایینی. قورئـان خوێن خێزانداره‌وخاوەنی چوار منداڵە، کەڕۆژانە بەبـەردەوامی لەگەڵ مناڵەکانی خـەریکی قورئـان خوێندنـەو فێـری چۆنیەتی خوێنـدنی قورئانیـان دەکـات . شـایانی باسـە شـێخ ئەبەبـەکر

ئەلــشاتری هەفتــەی چــەند جارێــك بەتــەنها ســەردانی ســەر ڕووبارەکان دەکات و بــەدیار شــەپۆلەکانی ئــاو بــەدەنگی بــەرز قورئان دەخوێنێت .

نــاوبراو بــۆ بەشــداریکردن لەچــەند خــولێکی قورئــانی پــیرۆز ســەردانی ولاتــانی ( میــسر و بــەحرێن و ئیمــارات و کوێــت )ی، کردووە و ڕۆڵی گرنگی گێڕاوە..

هەروەها هــەڵگری بڕوانامــەی بەکالۆریۆســە لەبەشــی ژمێریــاری بۆساڵی ٢٠٠٠ ی زایینی.



## ﴿ عادل الكلبانی ﴾

ناوی تەوای عادل کوڕی سالم کوڕی سەعیدی کلبانییە ، لەساڵی ١٩٥٨ لەشاری ڕیازی پایتەختی سعودیە لەدایك بووە . خێزاندارە و پێنج کوڕ و حەوت کچی هەیە ، بۆ یەکەمجار لەلای لەلای مامۆستا ( حسن بن غانم الغانم ) دەستی بە خوێندنی قورئانی پیرۆز کردووە ،هەروەها بەشێکی سەحیحی بوخاری و سونەنی ترمزی و هەندێك لەتەفسیری ( ابن الكثير ) ی لای مامۆستای ناوبراو خوێندووە و پاشان لەلای دکتۆر ( مصطفی مسلم ) تەفسیری بەیزاوی خوێندووە . دواتر لەلای شێخ ئەحمەد موستەفا قورئانی خوێندووەو ئیجازەی پێدراوە بەڕیوایەتی ( حفص عن عاصم ) لەڕێگەی شاتبی . شێخ عادل خاوەن دەنگێکی خۆش و ویژدان هەژێنە و دەنگێکی لەڕادەبەدەر حەزین وغەریبی هەیە و لەناوەڕاستی نەوەدەکان لەنوێژی تەراویحی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز خەتمێکی بۆ تۆمارکراوە ، هەروەها ئێستاکەش لەژیانداماوەو لە مزگەوتێکی ڕیازی پایتەخت پێشنوێژ و وتارخوێنە .




## ﴾ توفيق سعيد الصائغ ﴿

لەدایك بووی١٩٧٤ ی شاری ئەسمەرای ولاتی سعودیە یە و خوێندنی سەرەتایی لەقوتابخانەی شافەیسەڵ تەواو کردووە و دواناوەندیشی لە قوتابخانەکانی دەریای سوورو ئەلرازی تەواو کردووە، هەروەها دەرچووی کۆلێژی ئیمام محەممەدی کوڕی سعود و خاوەنی بڕوانامەی ماجستێرە لەکۆلێژی ئومولقورا، لەسەر دەستی چەند مامۆستایەك لەمیسر و سعودیە و سوریا و پاکستان فێری خوێندنی قورئانی پیرۆز بووە و ئێستاکەش ژمارەیەکی زۆرقوتابی فێری قورئان دەکات .

لەژیانیدا سەردانی ئەم ولاتانەی کردووە ( باشووری ئەفریقیا ، ئەمریکا ، سوید ،ئەلمانیا ، فەرەنسا ،بەلجیکا ، سەنگافورە ، قەتەر ، سوریا ، میسر ، ئیمارات )، ئەم قورئان خوێنە لەم کەناڵە ئاسمانییانەش بەرنامەی پێشکەش کردووە ( اقرأ ،

المجـــد ، المجـــد انگليـــزی ، قطـــر ) و دوو كتێبيـــشی بەچـــاپ گەياندووە بەناوەكانی ( جوامع الدعاء – كن مغفورا له )

ئەو ئەركانەی پیێ سپێردراوە :

سەرۆكی لیژنەی پێشبڕكێكانی قورئان لە دەوحە.

سەرپەرشتياری نەخۆشخانەی ئەمەل / سعوديە .

سەرۆكی بانگەوازی ئەرتيری لە جەدە .

پێشنوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی اللامی لە جەدە.

وانەبێژ لە قوتابخانەی ئەمجاد لە جەدە .

سەرپەرشتياری كۆشكی هودا بۆ بلاّوكردنەوە .



## ﴿ عەبدوللا جوهەنی ﴾

ناوی تەواوی (**عبدالله عواد فهد معيوف عبدالله محمد كديوان الهميمي الذبياني الجهني** )ە، و لەساڵی ١٩٧٤ لە شاری مەدینەی پیرۆز لەدایك بووەو خێزاندارە و دووكوڕی هەیە بەناوەكانی ( عەبدولعەزیز و محەممەد ) لەگەڵ دووكچ، لەتەمەنی منداڵیدا سەردانی مزگەوتی ئەشرافی دەكرد لەمەدینە و لەومزگەوتە و بەهیممەتی باوكی توانی هەموو قورئانی پیرۆز لەبەربكات.

دەرچووی كۆلێژی قورئانی پیرۆزە لە زانكۆی ئیسلامیی، و لەتەمەنی شانزە ساڵانیش هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەركردووە، لەژیانیشیدا لەم مزگەوتانە بە پێشنوێژ خوێن دامەزراوە ( **المسجد الحرام الشريف، المسجد النبوي الشريف، مسجد قباء، مسجد القبلتين** ) شێخ عەبدوللا خۆشحاڵە كە كراوەتە پێش نوێژخوێنی گەورەترین و پیرۆزترین مزگەوتی

سەر ڕووی زەوی کە ئەویش ( مسجد الحرام )ە، کەڕۆژانە پێش نوێژی بۆ هەزاران نوێژخوێن دەکات، جگە لەمەش پێش نوێـژی بـۆ کۆمـەڵێك موسـڵمانی ئـەمریکی کـردووە لـە گـەورەترین مزگەوتی موسڵمانان لە واشنتۆن.



## ﴿ شێرزاد عەبدولڕەحمان تاهیر ﴾

شـــێرزادی قورئـــان خـــوێن بەرەچـــەڵەك كوردەومەزهـــەب شـــافیعییەوبە ( بـــدر القـــراء ) ناســـراوە .. لەســـاڵی١٩٦٨ لەبنەماڵەیـەكی كـوردی دینـدار لەگـەڕەكی نوعمانیـەی شـاری موسڵ لەدایك بووە، دووكوڕی هەیە بەناوەكانی ( عبـدالرحمن و عبـدالله ) لەسـاڵی١٩٨٥ ئامـادەیی تـەواو دەكـات و لەكۆلێـژی ئەندازیاری زانكۆی موسڵ وەردەگیرێت ،دوای چوارساڵ واتـا لەســـــاڵی١٩٩١ كۆلێژەكەتـــــەواو دەكـــــات .شـــــێرزاد هەرلەمنداڵییـەوەلای بـاوكی فێـری خوێنـدنی قورئـان دەبێـت ، باوكیشی مامۆستای زمانی عەرەبی دەبێت و شارەزایی تەواوی خوێنـدنی قورئـانی پـیرۆز هەیـە ،نـاوبراو هـەر لـەتافی لاوێتیـدا توانی دەنگـە خۆشـەكەی خـۆی بدۆزێتـەوەو گـوێگران پێیـەوە سەرسام ببن بۆیە ناویان نـا ( مەنـشاوی بـچكۆڵە ) ، شـێرزادی قورئـــان خـــوێن لەتەمـــەنی مناڵییـــەوە هـــەمووڕۆژانی هـــەینی

سـەردانی مزگـەوتی ئـەلحافزی دەکـرد لەگـەڕەکی جـەزائیری شاری موسڵ و تێیدابەر لەوتاری هـەینی قورئـانی دەخوێنـد .. قورئان خوێن لەم قۆناغەدا لای چەند مامۆستایەك وەك ( شـێخ سـەیفەددین هـادی و شـێخ ئـەبو عەبدولعـەزیز عیمـادەدین شەمسەددین پێشنوێژی مزگـەوتی ( الحـافظ ) فێـری چـۆنیەتی خوێندنی ( تـیلاوە ) دەبێـت ، تـاوەکو دوای قۆنـاغی ناوەنـدی .پاشـان ڕوودەکاتەمزگـەوتی ( القادسـیە ) و پـاش هـەوڵ و مانـدووبوونێکی زۆر تـوانی شـێخی قورئـان خوێنـانی موسـڵ ئیـبراهیم فـازل مەشـهەدانی بناسـێت . لـەلای نـاوبراو دەسـتی کردبەخوێندنی (اصول روایـە حفـص ) و لـەماوەی ساڵێکیـشدا لەسورەتی (البقرە تا سورەتی النساو ) لـەماوەی ئـەو سـاڵەدا سوودێکی زۆری وەرگرت ، دواتر لەساڵی ١٩٨٦ لەسەر شێوازی ( ابی عمرو البصری ) سورەتی( البقرە ) ی خوێندبەگێڕانەوەی ( الدوری والسوسی ) ...

خۆشـترین ڕۆژ لـەژیانی قورئـان خـوێن ئـەوڕۆژە بـوو کەلەئاهـەنگێکی گـەورەدا لەمزگـەوتی قادسـیە لەلایـەن شـێخ عەبدوللەتیف خدر سۆفی مۆڵەتی قورئان خوێندنی پێدرا ..

لەساڵی ١٩٩٥ ڕووی کردە ولاَتی یەمەن و لەشاری سەنعای پایتەخت نیشتەجێ بوو، و شاشان چۆتەشاری ( الحدیدە ) ... دواتر ولاَتی یەمەنی جێدەهێڵێ و ئێستا لەئیماراتی عەرەبی یەککگرتوو نیشتەجێ بووە و تائێستایش هەر لەو ولاَتەیە ، و کە پێش نوێژ خوێنی مزگەوتی ( محمد حسن الشیخ ) ە، لەدوبەی لەگرتووخانەی دوبەی ناوەندی قورئان دەڵێتەوەو لەپێشبڕکێی ( اجمل ترتیل ) ناوبڕیوان بووە ، و ئێستاش لەژیاندا ماوەو سایتێکی تایبەت بە خۆی هەیە .

www.sherzaad.net



قورئان خوێنان شێرزاد عبدالرحمن و عبدالرحمن السدیس



لەگەڵ قورئان خوێنان محمدایوب و عثمان صدیقي



## ﴿ هانی ئەلڕەفاعی ﴾

قورئان خوێن هانی عەبدولڕەحیم ئـەلڕەفاعی لەسـاڵی ١٩٧٤ ی زایینی لەوڵاتی سعودیە لەدایك بووە و خێزاندارە و پێنج کـوڕی هەیـە، ئـەم قورئـان خوێنـە بەڕێوەبـەری کـارگێڕی کاروبـاری شـەرعییە لـە نەخۆشـخانەی شـا فەیـسەڵی تایبـەت و لەهـەمان کـاتیش پێـشنوێژ خـوێن و وتاربێـژی مزگـەوتی (العنانـە) یـە لەجەددە.

قورئـان خـوێن خـۆی دەگێڕێتـەوە و دەڵـێ : لەتەمـەنێکی زۆر بچووکدا حەز و خولیام چووە سەرقورئان خوێندن و لەتەمـەنی شـەش سـاڵان پەیوەنـدیم بەبنکەیـەکی لەبـەرکردنی قورئـانی پـیرۆز کـرد کەلەمزگـەوتێکی نزیـك ماڵەکەمانـدا بـوو، پاشـان لەسـاڵی ١٩٩١ لەسەردەسـتی شـێخ محەممـەد عەبدولکـەریم ئەلعەشیـشی هـەموو قورئـانی پـیرۆز لەبەربکـەم و ئـەو رۆژەش

خۆشترین رۆژبوو لەژیانم چونکە سوپاس بۆخوای گەورە توانیم لەتەمەنێککی زوودا هەموو قورئانی پیرۆز لەبەربکەم.

قورئان خوێن بۆیەکەمجار لەتەمەنی دەسالآن پێش نوێژی بۆ نوێژخوێنانی مزگەوتی تائیف کرد کەئەوکاتە بیست جزئی قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە، هەروەها ئەم قورئان خوێنە بەهۆی خوێندنی سورەتی ئال عیمران ناوبانگی دەرکرد کەلەساڵی ١٩٨٩ لەنوێژەکانی تەراویح لەهەمان مزگەوت خوێندوویەتی...

لەشاری جدەی سعودیەش بەشداری لەپێشبڕکێیەکی قورئانی پیرۆزکردو پلەی نایابی پێبەخشرا و بەیاریدەدەری پێش نوێژخوێنی مزگەوتی شا عەبدولعەزیز دەستنیشان کرا، پاشان لەساڵی ١٩٩٣ لەمزگەوتی ئەبوبەکری سدیق لەگەڕەکی بەغدادیەی شاری جدە بە ئیمام وخەتیب هەڵبژێردرا و تائێستاش لەم مزگەوتە بەوپیشەیەی بەردەوامە.

هانی ئەلرەفاعی بەچاوێکی پڕ لە گریانەوە ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە و دەڵێ : لەساڵی ١٩٩٠ کاتی وەرگرتنی بڕوانامەی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز باوکم تەمەننای دەکرد بەشداری لە ئاهەنگەکەدا بکات و بڕوانامەکەم ببینێت، بەلآم لەوکاتەدا

بـــاوکم ڕەوانـــەی نەخۆشـــخانە کـــرا بـــەهۆی نەخۆشـــییەکەی کەنەخۆشی دڵ بوو، و ساڵانێك بوو بەدەست ئەو نەخۆشییەوە دەیناڵاند... نەمزانی لەگەڵ باوکم بۆ نەخۆشخانە بچم یاخود بۆ ئاهەنگی بڕواناکەم ؟؟!! بەهـەرحاڵ بـاوکم پێـی وتم : تـۆ بـۆ ئاهەنگەکـەت بـڕۆ... بـرا و دراوسـێکانم باوکمیـان بـەرەو نەخۆشـخانە بـرد و منـیش بـەرەو ئاهـەنگی وەرگرتنـی بڕوانامەکەم ڕۆیشتم ... دوای وەرگرتنـی بڕوانامەکـەم دەسـت بەجێ وبەپەلـە خـۆم گەیانـدە ئـەو نەخۆشخانەیەی کـەباوکمی تێـدا خـەوێنرابوو ... زۆر دڵخـۆش بـووم لەلایـەك بڕوانامەکـەم بەدەستەوەیە و لەلایەك ئومێد و ئاواتەکانی بـاوکم دەهاتـە دی ... کەگەیشتمە ئەو ژوورەی باوکمی تێدا خـەوێنرابوو تـەزوویێك سەرتاپای لەشمی داگرتەوە و بینیم دایکم و خوشك و براکـانم بەسـەرتەرمی بـاوکم دەگـرین و بینـیم چـاوەکانی لێـك نـاوە و گیـــانی ســـپاردووە، ئـــەوەیان ناخۆشـــترین ڕۆژی ژیانمـــە و تائێستاش کە ئەو ساتانەم دێتەوە یاد لەپرمـەی گریـان دەدەم و چاوەکانم پڕدەبن لەفرمێسك ...



## ﴿ محمود خليل قاريء ﴾

ئەم قورئان خوێنە بە باوکی ئیبراهیم ناسراوە وناوی تەواوی مەحمود خەلیل عەبدولڕەحمانە و لەساڵی ١٩٧٥ لە شاری مەدینە لەدایك بووە، لەتەمەنی دەساڵان هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە و لەساڵی ١٩٨٥ بڕوانامەی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزی پێبەخشراوە...

جگەلەمەش بڕوانامەی ( قراءة سبعة ) ی پێ بەخشراوە، هەروەها هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆسە لە کۆلێژی قورئانی پیرۆز لە شاری مەدینەی پیرۆز، لەتەمەنی چواردە ساڵان بۆتە مامۆستای چەندین قوتابی و فێری خوێندنی قورئانی پیرۆزی کردوون. بۆماوەی هەشت ساڵ بە مامۆستای ئایینی لەکۆلێژی مامۆستایانی مەدینە دامەزراوە، بۆماوەی سێ ساڵیش لە کەناڵی یەکی تەلەفزیۆنی سعودیە بەرنامەی ( في ظلال القران )

ی، پێشکەش کردووە، هەروەها ماوەی هەشت ساڵ بە پێش نوێژخوێنی مزگەوتی ( قباء ) دامەزراوە و دووساڵیش لەمزگەوتی ( قبلتین ) کراوەتە پێش نوێژخوێن.

لەسەرداوای دەوڵەتی کوێت بۆ ماوەی چوار ساڵ لەساڵەکانی ١٩٩٠ تاوەکو ١٩٩٤ بۆتە ئیمام و خەتیبی مزگەوتی فاتیمە، لە مزگەوتی ( صانع ) لەگەڕەکی ( مصانع ) ی مەدینە بۆتە ئیمام و خەتیب و ئێستاش ئیمامی مزگەوتی ( قباء)ە، لەهەمان کاتیش وانەکانی قورئانی پیرۆز و زانستەکانی تەجوید دەڵێتەوە، ئەم قورئان خوێنە پەیوەندیی پتەوی لەگەڵ قورئان خوێن محەممەد ئەیوب هەیە و بەبەردەوام یەکتری بەسەر دەکەنەوە.



﴿ محەممەد ئەیوب ﴾

ناوی تەواوی ( محمد أیوب بن محمد یوسف بن سلیمان عمر )ە، و لەساڵی ١٩٥٣ ی زایینی لەشاری مەککەی پیرۆز لەدایك بووە و لەساڵی ١٩٦٥ ی زایینی پەیوەندی بەبنکەی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز کردووە و لەسەردەستی شێخ ( عبدالرحمن القاريء ) هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە و لەهەمان کاتیش زانستی تەجویدی بەڕەوانی خوێندووە.

دوابەدوای تەواوکردنی قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی وناوەندی لەساڵی ١٩٧٢ چۆتە مەدینەی پیرۆز و لەوێ درێژەی بەخوێندنی ئامادەیی داوە، پاشان لەساڵی ١٩٧٦ توانی ماستەرنامە لە زانکۆی ئیسلامیی وەربگرێت و ماستەرنامەکەیشی بەم ناونیشانە بوو ( مرويات سعيد بن جبير في التفسير من أول سورة يونس إلى آخر القرآن ).

بۆمـاوەی دەسـاڵیش لـەم زانکۆیـە بـە وانەبێـژ دامـەزراو کـرا بەسەرپەرشتیاری گشتی تاقیکردنەوەکانی زانکۆ، ئـەم قورئـان خوێنــە دوای هــەوڵێکی زۆر و خوێنــدنی ئێجگــار زۆر تــوانی لەســاڵی ١٩٨٨ ی زایینــی لەهــەمان کۆلێـژ بڕوانامــەی دکتــۆرا بەدەست بهێنێت.

لەماوەی ژیانیدا لەم مزگەوتانە کراوەتە ئیمام وخەتیب:

( إمام متعاون في المسجد النبوي منذ عام ١٩٨٩.

إمام في مسجد قباء لصلاتيّ التراويح والقيام.

إمام مسجد العنابية من عام ١٩٧٥-١٩٨٣.

إمام مسجد عبد الله الحسيني من ١٩٨٤

خطيباً لمسجد أحمد بن حنبل بالحرة الشرقية.

هـەروەها لـەتافی لاوێتــی لای ئـەو کۆمەڵـە مامۆسـتایە وانـەی ئیسلامیی خوێندووە:

( الشيخ عبد العزيز محمد عثمان ــ الشيخ محمد سيد طنطــاوي ــ الشيخ أكرم ضياء العمري ــ الشيخ محمد الأمين الــشنقيطي ــ الشيخ عبد المحسن العباد ــ الشيخ عبد الله محمد الغنيمان ــ الشيخ أبو بكر الجزائري ).

هەروەها بڕوانامەی پێ بەخشراوە لەخوێندنی قورئـانی پـیرۆز بەریوایەتی ( حفص عن عاصـم )، لەژیانیـدا سـەردانی چـەندین وڵاتی کردووە وەکو: بەرازیل و بەریتانیا و پاکستان و تورکیـاو سەنیگال و مالیزیا و تێیـدا وانـەی زمـانی عـەرەبیی وتۆتـەوە و لەچـەندین خولـدا ڕۆڵـی بەرچـاوی گێـڕاوە و لەسـەرەتای نـەوەدەکانیش لەسـەرداوای جالیـەی ئیسلامیی لەمزگـەوتێکی موسـڵمانان لـە شـاری ( بێرمنگهـام ) بـەریتانی بۆتـە پێشنوێژخوێن، قورئان خوێن ئێستاش لەژیانداماوە و لەزانکۆی ئیسلامیی شاری مەدینـە مامۆسـتای زانستەکانی ئیسلامییە و چەندین کاسێتی تۆمارکراوی نوێژەکانی تەراویحی هەیـە، جگـە لەتۆمارکردنی خەتمێکی قورئانی پیرۆز بەریوایەتی ( حفص عن عاصـم ) لەسـتۆدیۆکانی مەدینەلەسـەر ئـەرکی کۆمەڵگـەی شـافەهد لەسـاڵی ١٩٩٤ ی زایینـی، هـەروەها قورئـان خـوێن محەممەد ئەیوب بلاوکراوەیـەکی چاپکرواش هەیـە لـەژێرناوی (أليس للعلماء حق كغيرهم ) ...



## ﴿ علی عبدالله جابر ﴾

ناوی تەواوی قورئان خوێن ( **علي بن عبد الله بن صالح بن علي جابر السعيدي اليافعي الحميري القحطاني**)ە، و لەساڵی ١٣٧٣ ی کۆچی بەرامبەر ساڵی زایینی لەشاری جددە لەدایك بووە، لەتەمەنی دەساڵان لەلای باوکی هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە و وەك خۆی دەگێڕێتەوە کەباوکی بەهیچ شێوەیەك نەیهێشتووە لەکۆڵان لەگەڵ منداڵانی تر یاری بکات تاوەکو هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە.

خوێندنی سەرەتایی وناوەندی لەقوتابخانەی ( **دار الحديث** ) ی، شاری مەدینە تەواودەکات و دوای قۆناغی ئامادەییش لەکۆلێژی ئیسلامیی وەردەگیرێت، و لەساڵی ١٩٧٥ بەپلەی نایاب کۆلێژی شەریعە بەشی زانستە ئیسلامییەکان تەواو دەکات. لەماوەی ژیانیدا لەلای هەردوو مامۆستایان (**عبدالعزيز**

**بن عبدالله بن باز** و **محمد المختار بن أحمد الجكني الشنقيطي** ) خوێنـدووه و بەبـەردەوام تادرەنگـانی شـەو لای ئـەو دوو خوالێخۆشبووه زانسته ئیسلامییەكانی خوێنـدووه و زۆریـش شانازی بـەوەكردووه كەلەشاری گـەورەترین مـرۆڤ پـەروەردە بووه كەشاری مەدینه و شـاری پێغەمبـەری پێشەوایە سـەلامی خوای لەسەربێت.

لەسـالّی ۱۹۷٦ و بەمەبەسـتی وەدەسـتهێنانی ماسـتەرنامه رووله‌شاری ریازی پایتەخت دەكات و لەسالّی ۱۹۸۰ ی زایینـی ماسـتەرنامەكه بەپلـەی زۆرباشـه مـسۆگەردەكات كـەناوەرۆكی ماستەرنامەكەشی (**فقه عبدالله بن عمر رضي الله عنهما وأثره في مدرسة المدينة** ) بوو، پاشان بەبڕیارێكی میری قورئان خوێن بـه دادوەری یەكەم دادەمـەزرێت و لەسـەرداوای خـۆی ئـەم ئەركـه رەت دەكاتەوە و وەری ناگرێت و پرسیاری لێكرا كەبۆچی ئـەم پۆسـتەت وەرنـەگرت و لەوەلأمـدا وتـی : لەبەرفـەرموودەی پێغەمبەری پێشەوا كه فەرموویەتی (**القضاة ثلاثة: قاضيان في النار وقاضٍ في الجنة** ) ترسـام لـەوەی دادگـەریم پێنـەكرێت و هەروەها وتـی (**ما كنت أريد الاقتراب من القضاء أو أي أمر يتعلق به** ) ... ئنجـا بـەبڕیارێكی تـری مـیری كـرا بەوانەبێـژ

لەکۆلێــژی پــەروەردە بەشــی زمــانی عــەرەبیی و زانــستە ئیسلامییەکان، لەهەمان کاتیش بە پێشنوێژخوێنی کۆشکی شا خالید عەبدولعەزیز لە تائیف دامەزرا و دواتـر بـۆ یەکـەمجاریش کەکرا بە پێشنوێژخوێنی مزگەوتی حەرام لەبیـست و سێیەمین رۆژی مـانگی رەمـەزانی سـاڵی ١٩٨١ دابـوو، لەسـاڵی ١٩٨٣ ی زایینی لەسەرداوای خۆی گوازرایەوە شاری مەدینەی پـیرۆز بـۆ درێژەدان بەخوێندن و وانە وتنەوە لە کۆلێـژەکانی ئـەو شـارە. هەرلەوساڵەش بـۆ خوێنـدنی زمـانی ئینگلیـزی سـەردانی ولاّتـی کەنەدای کرد و لەووڵاتە خەتمێکی قورئـانی پـیرۆزی لەسـتۆدیۆ بۆتۆمارکرا.

لەساڵی ١٩٨٥ جارێکی تر دەستی بەخوێنـدن کـردەوە تـاوەکو توانی پلەی دکتۆرا لـە پـەیمانگای دادوەری بـالاّ مـسۆگەربکات بەپلەی نایاب نامەی دکتۆراکەشی بەناویـشانی ( **فقه القاسم بن محمد بن أبي بكر الصديق موازناً بفقه أشـهر المجتهـدين** ) بـوو، لەســاڵی ١٩٨٦ ی زایینــی جــارێکی تــر گوازرایــەوە مزگــەوتی حەرام و بەپێشنوێژخوێن دامەزرایـەوە، لەگـەڵ سـەرقاڵی زۆری بەخوێندنەوە بـەردەوام ئـەم قورئـان خوێنـە خـەریکی قورئـان خوێندن بوو و بەردەوامیش دەیووت (**القرآن ليس المقصود منـه**

**التغني وتزيين الصوت به وإنما يجب أن يكون واقعاً عملياً سلوكياً يقوم الإنسان بتطبيقه في واقع حياته كلها**)، قورئان خوێن وەنەبێ هەر قورئان خوێن بووبێ و بەس بەڵکو لەزۆربەی بۆنە و یادەکان وتاری پێشکەش دەکرد و هانی گەنجانی دەدا خۆیان بەبەرەکەت و بەخششەکانی قورئانی پیرۆز ئارایشت بدەن و هانی بانگخوازانی ئیسلامیشی دەدا زیاتر لەوتارەکانیان هەقیقەت و رۆشنایی ئیسلام بۆخەڵکان روون بکەنەوە.

## چۆنیەتی نەخۆش کەوتنی و مردنی:

قورئان خوێن ماوەی زیاتر پێنج ساڵ بەدەست نەخۆشییەوە دەیناڵاند لەوکاتە نەخۆشییەکەی زۆری بۆهێنا کە پزیشکان نەشتەرگەریەکیان بۆ کەمکردنەوەی کێشی ئەنجامدا و نەشتەرگەرییەکە بووە هۆکارێك بۆکەوتنی لەناوجێگا، و جگە لەوەش بۆماوەی زیاتر لەمانگێك لەبەشی چاودێری پزیشکی مایەوە لەنەخۆشخانە، تاوەکو لەرۆژی چوارشەممە ی ساڵی ١٩٩٦ ی زایینی گیانی لەدەستدا، سەیر لەوەدابوو لەوکاتەی گیانی سپاردبوو بۆماوەی دوانزە کاتژمێر لەناو ساردکەرەوەکانی نەخۆشخانە دانرابوو کەچی جەستەی

هـەروەکو خـۆی بـوو و بـەهیچ شـێوەیەك رەق نەبووبوبـەڵکو وەکـو خـۆی ئاسـایی بـوو لەکاتێـکـدا پزیـشکەکان رایانگەیانـد کەمردوو بۆماوەی شـەش کاتـژمێر لـەناو ئـامێری ساردکەرەوە سەرتاپای جەستەی رەق دەبێت و نەرمایی بەسەر جەستەیەوە نامێنێت ..!!!!لەمەراسیمێکی گەورەدا تەرمی قورئـان خـوێن لەگۆڕسـتانی ( الشرائع ) ی شاری مەککە بەخاك سپێردرا..



قورئان خوێن ( محمد ایوب ) نوێژی مردوو لەسـەر تـەرمی قورئـان خوێن ( علی عبدالله جابر ) دەکات ١٩٩٦



## ﴿ صلاح بو خاطر ﴾

ئەم قورئان خوێنە یەکێکە لە قورئان خوێنە هەرە ناودارەکانی ئـەمڕۆ و توانیویـەتی بـەهۆی دەنگـە بەسـۆزەکەی بیـسەران سەرسام بکات کەتابڵێی دەنگێکی پڕ و خۆشـی هەیـە، نـاتوانی دەنگـــی لەگـــەڵ شـــێخ عەبـــدولڕەحمان ئەلـــسدێس جیابکەیتەوەلەبەرئەوەی دەنگ و شێوەی خوێندیان زۆر لەیەك دەچێت ...!!!

قورئان خوێن لەشاری شاریقەی ئیمـاراتی عـەرەبیی یـەکگرتوو لـەدایك بـووە، و بـەناوبانگترین بنەماڵـەی بوخـاترن، لەشـاریقە لەرادەبـــەدەر دەوڵەمەنـــد و خێرخـــوازن، هـــەروەها برابچووکەکەیـشی بـەناوی ئەحمـەد یەکێکـە لەسـرودبێژە بەناوبانگەکانی ئیمارات، شێخ سەلاح بوخاتر لەبەر نەرم ونیانی و بـیٚ فیـزی وتـەوازوعی بۆتـە خۆشەویـستی هـەموو شـاریقە و رۆژانـە نوێـژخوێنێکی ئێجگـار زۆر روولەمزگـەوتی گـەورەی

شاریقه دەکەن و لەدوای ناوبراو نوێژەکانیان بەکۆمەڵ ئـەنجام دەدەن و تـام وچـێژێکی تایبـەت لەنوێـژەکانیان وەردەگـرن بـەهۆی دەنگخۆشـی و تەجویـدە رەوانەکـەی شـێخ سـەلاح بوخـاتر.بەتایبـەتی تـر لـەمانگی رەمـەزانی هـەموو سـاڵێك نوێـژخوێنێکی ئێجگـار زۆر سـەردانی مزگەوتەکـەی دەکـەن کەتەنانـەت سەرشـەقامەکانیش پـڕ دەبـن لەنوێـژخوێن لەلایـەن کەناڵی ئاسمانی شـاریقەش راسـتەوخۆ نوێـژەکانی تـەراویح بـۆ سەرانسەری جیهان دەگوازرێتەوە.



**وێنەی قورئان خوێن لەکاتی نوێژی تەراویح مانگی رەمەزانی ٢٠٠٧**



# ﴿ عبدالعزيز الاحمد ﴾

ناوی تـەواوی ئـەم قورئـان خوێنـە ( عبـد العزيـز عبـد الله محمـد الأحمد )ە، و لەساڵی ١٩٦٦ ی، زایینی لەشاری مەدینە لـەدایك بــووە و خــاوەنی بڕوانامــەی دکتۆرایــە لــە ( علــم الــنفس ) بڕوانەمەی دکتۆراکەیـشی لەسـەرنامەی ( فعاليـة برنـامج نفـسي إسـلامي لعـلاج القلـق عنـد المـراهقين في المرحلـة الثانويـة )، کەکارەکەیـشی بریتـی یـە لـە (الإرشـاد والتوجيـه النفسـي )، مامۆسـتای یاریدەدەرە لـە زانکـۆی ( قـصيم ) ی سـعودیە بـۆ وانـەکانی عـەرەبی و ( علـم الـنفس ). جگـە لـەم دکتۆرایـەش لەسەروبەندی دکتۆرایـەکی تـرە لـەزانکۆی بـەیروتی ئیـسلامیی لــەلوبنان لەبەشــی شــەرعەی ئیــسلامیی، لەســاڵی ١٩٩٦ ی زایینیش ماستەرنامەی وەرگرت لەسـەربابەتی ( مفهـوم الـصحة النفسية عند ابن القيم رحمه الله، والدراسات النفـسية الحديثـة – دراسة تحليلية ).

لەگەڵ خوێندنیش زانستەکانی قورئـان و تەجوید و چۆنیەتی خوێنـدنی قورئـانی پـیرۆزی پـشتگوێ نەخـستووە و لەسـاڵی ۱۹۸۳ ی زایینی لەلایـەن ( د. سـلیمان الغفـیص ) توانیویـەتی هـەموو قورئـانی پـیرۆز لەبـەربکات و مامۆستاکەیـشی بەپلـەی زۆرباشە مۆڵەتی پێداوە، لەساڵی ۱۹۸۷ ی، زایینـیش لەلایـەن زانای ولاتی سوریا (حسین أبو الغصین ) زانستەکانی قورئـان و تەجویـدی بـەڕەوانی تـەواو کـردووە، دکتـۆ عەبدولعـەزیز ئەلئەحمـەد لەژیانیـدا سـێ جـۆر خـەتمی قورئـانی پـیرۆزی بۆتۆمـارکراوە دووخـەتمیان لەنوێـژەکانی تـەراویح لەسـاڵەکانی ۱۹۹۵ و ۱۹۹٦ و خـەتمی سـێیەمیان لەسـاڵی ۲۰۰۲ ی زایینـی لەستۆدیۆ بـۆی تۆمـارکراوە و ئێـستاش سـەرقاڵی تۆمـارکردنی تەفسیری قورئانی پیرۆزە بەدەنگی خۆی.

قورئـان خـوێن لەلایـەن ئـەو کۆمەڵـە مامۆسـتایە فـەرموودە و راڤەی فەرموودەکانی خوێندووە و بڕوانامەی پێدراوە:

الشيخ يحيى اليحيى نصف صحيح مسلم .

الشيخ شـايع الدوسـري نـصف صـحيح مـسلم البـاقي (مختـصر المنذري).

الشيخ سلمان العودة معظم صحيح البخاري (مختصر الزبيدي).

الشيخ محمد الروق رحمه الله كتاب الزاد.

الشيخ عبد الله البسام رحمه الله كتاب الروض المربع.

الشيخ فهد المشيقح حفظه الله كتاب الزاد في الفقه.

الدكتور صالح المنصور حفظه الله كتاب الروض المربع والأصول في علم الأصول.

الشيخ أحمد بن عبد الله بن حميد حفظه الله منظومة العمريطي.

الشيخ عبد الله بن صالح الفوزان حفظه الله كتاب الأصول في علم الأصول والورقات في أصول الفقه.

الشيخ عيد اليحيى حفظه الله كتاب التوحيد والواسطية.

الشيخ محمد بن علي السعوي كتاب الحموية في العقيدة.

الشيخ حمد المحيميد ألفية ابن مالك في اللغة العربية.

الشيخ عبد العزيز الزايد أيضاً أوضح المسالك.

الشيخ محمد المنصور المنسلح في الفقه (الزاد) وفي الفرائض (الرحبية).

الشيخ سليمان العبيد والشيخ عبد العزيز الزهيري في البلاغة.

بۆماوەی ساڵێك لە ویلایەتی (كولورادو ) ی، ئەمركی بۆتە مامۆستای وانەی راڤەی فەرموودەكانی سەحیحی بوخاری،

لەمزگـەوتی ئـەمیر عەبـدولرەحمان کـوڕی عەبـدوللا لـەدوای نوێژەکان وانـەی ئیـسلامیی بـە قوتابیـانی مزگەوتەکـە وتـووە، لەسـەرجەم گرتووخانـەکانی شـاری ریـازی پایتـەخت وتـار و محـــازەرەی پێــــشکەشی بەندییــــەکان کـــــردووە لەهەمووبوارێکدابەتایبـەتی تــر رەفتــار و هــەڵس و کــەوت و پەروەردەی نەفس و گیـان و دڵـەکان و پابەنـدبوون بەیاسـا و شـەرعی ئیـسلامیی. قورئـان خـوێن لـەماوەی سـاڵێکدا بۆتـە مامۆستای ئەم خولانە:

دورة: ركـــــــائز عـــــــلاج القلـــــــق

دورة: التعامــــل مــــع المــــراهقين فنـــاً وأســـلوباً.

دورة: الطفولـــة، معانـــاة وتوجيـــه، قواعـــد وأســـاليب

دورة مهــــــارات الحفــــظ: عـــــشر مهــــــارات

دورة: أولادنا بين الإلكترونيات والفضائيات.

لەسـالأنی ١٩٩٧ و ١٩٩٨ لەکـەناڵی ئاسمـانی ئەلمەجـد ئـەم بەرنامانەی پێشکەشی بینەران کردووە:

منتـدى الاستـشارات، الكلمـة الطيبـة، ليـالي رمـضان، الجانـب المظلم...

جگەلـــەو بەرنامانـــەش لەکـــەناڵی یـــەکی ســـعودیە ئـــەم دووبەرنامەیـەی پێـشکەشی بینـەران کـردووە (مـریض مـاذا أفعـــل؟ ، تفاءل، مع طفلي )، جگە لـەم هەمـوو کـارە کراوەتـە وتارخوێن و پێش نوێژ خوێنی کۆمـەڵێك مزگـەوت لەشـارەکانی مەککـە و مەدینـە و دەمـام و ریـازی پایتـەخت و رۆڵـی گرنگـی گێراوە.



## ﴿ العيون الكوشي ﴾

لەساڵی ١٩٦٧ ی زایینی لەشاری ( ئاسفی ) وڵاتی مەغریب لەدایك بووە، ئەم قورئان خوێنە لەتەمەنی نۆ ساڵان توانیویەتی هەموو قورئانی پیرۆز لەبەربكات و مۆڵەتی قورئان خوێندنی پێدراوە لەسەر شێوازی ( ورش عن نافع )، و دووجۆر خەتمی قورئانی پیرۆزی بۆتۆمار كراوە.

ئێستاش پێشنوێژخوێن و قورئان خوێنی مزگەوتی ( ئەندەلوس )ە، لەشاری ( ئەناسی ) مەغریبی، و لەهەمان كاتیش هەڵگری بڕوانامەی بەكالۆریۆسە و دەرچووی كۆلێژی ئادابی عەسرییە، لەنوێژەكانی تەراویحی مانگی رەمەزان زیاتر لە حەڤدە هەزار نوێژخوێن لەدوای قورئان خوێن نوێژەكانیان دەكەن كەلەكەناڵی مەغریبی عەرەبیی بۆ بینەران دەگوازرێتەوە كەدەنگێكی لەڕادەبەدەر خۆش و كاریگەریی هەیە.



## ﴿ عبدالباري الثبيتي ﴾

ناوی تەواوی (عبـد البـاري بـن عـواض بـن علـي الثبـيتي )ە، و لەساڵی ١٩٥٩ ی زایینی لەشاری مەککەی پـیرۆز لـەدایك بـووە، و تەمەنی گەیشتۆتە نۆساڵان وانەی قورئانی بەقوتابیان بنکەی لەبەرکردنی قورئانی پـیرۆز وتۆتـەوە لەشـاری مەککـە، قورئـان خـوێن لەسـاڵی ١٩٧٩ ی زایینـی بڕوانامـەی قورئـان خوێنـدنی پێدراو، لەهەمان کـاتیش هـەڵگری بڕوانامـەی بەکالۆریۆسـە بـۆ زانـستەکانی ئیـسلام و دەرچـووی زانکـۆی شـا عەبدولعـەزیزە لەسعودیە. هـەروەها لەسـاڵی ١٩٨٩ ی زایینـی دبلـۆمی بـاڵای لەزانـستەکانی ئیـسلامیی لەکۆلێـژی شـەریعە بەپلـەی نایـاب پێبەخـشرا،لەساڵی ١٩٧٨ بنکەیـەکی لەبـەرکردنی قورئـانی پیرۆزی لەبەریتانیا دامەزرانـد و بـووە پێـشنوێژخوێنی جالیـەی ئیسلامیی لەو وڵاتە، لەساڵی ١٩٩٣ ی زایینی بـە پێـشنوێخوێن و وتار خوێنی مزگەوتی پێغەمبەر لەمەدینە دامەزرا..



## ﴿ ابراهيم الاخضر ﴾

ئەم قورئان خوێنە لەساڵی ١٣٦٤ ی کۆچی لەشاری مەدینەی پیرۆز لەدایك بووە و هەر لەو شارەش خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی تەواو کردووە، و دواتر لەپەیمانگای زانستی تەواو کردووە.پاشان بۆتە مامۆستای فێرکردنی زانستەکانی پیشەسازی.

لەلای مامۆستا ( عمر حیدری ) هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە و لەلایەن ئەو مامۆستایانەش زانستەکانی قورئان و ( قراءة العشرة ) ی تەواو کردووە (الشيخ حسن بن إبراهيم الشاعر ، الشيخ عامر بن السيد عثمان، والشيخ أحمد بن عبد العزيز الزيات ، الشيخ عبد الفتاح القاضي ، الشيخ عبد الله بن محمد الغنيمان ) .

لەساڵی ١٩٨٥ ی زایینی بەمامۆستای یاریدەدەر لەکۆلێژی قورئانی پیرۆزی سەر بەزانکۆی ئیسلامیی مەدینەی پیرۆز دامەزراوە و، هەر ئەوساڵەش کراوەتە پێش نوێژخوێنی مزگەوتی پێغەمبەر تاوەکو ساڵی ١٩٩٤ ی زایینی، ناوبراو جگە لەقورئان خوێندن کەسێکی راگەیاندن کارە و شاعیرێکی ناوداری ئیسلامییە و چەندین بەرنامەی لەتەلەفزیۆنە ئاسمانییەکانی ولاتی سعودیە پێش کەش کردووە و ئێستاکەش ئەندامە لەم چەند کۆمەڵەیە:

جماعة تحفيظ القرآن.

الجمعية الخيرية للخدمات الاجتماعية •

لجنة التحكيم المحلية والدولية لمسابقة القرآن الكريم التي تقيمها وزارة الشؤون الإسلامية والدعوة والإرشاد •

هەروەها چەندین کاسێتی نوێژەکانی تەراویحی بۆتۆمارکراوە جگەلەتۆمارکردنی خەتمێکی قورئانی پیرۆز لەستۆدیۆکانی مەدینە بەریوایەتی ( حفص عن عاصم ).



## ﴿ صلاح محمد البدير ﴾

لەشـاری ( هفـوف ) ی، ولاّتـی سـعودیە هاتۆتـە دنیـاوە و لەتەمـەنێکی زوودا توانیویـەتی هـەموو قورئـانی پـیرۆز لەبەربکات، قوتابی قۆناغی ناوەندی بووە کە بۆیەکـەمجا بۆتـە پـێش نوێـژ خـوێن لەمزگـەوتی ( ئیحـسـا ) ی، رۆژهـەڵاتی شـاری ( هفوف ).

کۆلێژی شەریعەی لەزانکۆی ( محمد بن سعود ) تـەواو کـردووە و، دواتـر تـوانی پـەیمانگای دادوەری تـەواو بکـات، دواتـر گوازرایەوە ریازی پایتەخت و لە کۆمەڵێك مزگـەوتی ئـەو شـارە بـە پـێش نوێـژ خـوێن دامـەزرا و دواتـر بەفـەرمانی وەزارەتـی ئـەوقافی سـعودی گوازرایـەوە شـاری مەدینـە ولەمزگـەوتی پێغەمبەر بەپێش نوێژ خوێن دامەزرا و چەندین خەتمی قورئانی پیرۆزی لەنوێژەکانی تەراویح بۆتۆمارکراوەو، ئێستاش دادوەری یەکەمە لەدادگای شەرعیی مەدینە.



## ﴿ حافظ خليل ﴾

ناوی تەواوی خوالێخۆشبوو (خەلیل ئیسماعیل عمر )ە، و لە ساڵی ١٩٢٠ی زایینی لە شاری بەغدا هاتۆتە دنیاوە، لە تەمەنی منداڵییەوە لای مامۆستایان (ملا عبدالله عمر و ملا ابراهيم العلى و عواد العبدلی) فێری قورئانخوێندن بووەو بە تەواوەتی لەبەری کردووە، لە تەمەنی سیانزە ساڵان خراوەتە بەر خوێندن لە پەیمانگای زانستی ئایینی لە مزگەوتی گەورەی (خاتوون) لە بەغدا کە ئەوکاتە حاجی (نەجمەدینی واعیز) و (قاسم ئەلقەیسی) وانەی عەقیدە و فێربوونی قورئانی پیرۆزیان دەوتەوەو پاشان وانەکانی (ئوسول ئەلفقە) و ڕاڤەی فەرموودەکانی تێدا دەخوێنرا. خوالێخۆشبوو لە ساڵی ١٩٤٣ پەیمانگای تەواوکردوو لە ساڵی ١٩٥٣ جارێکی تر سوودی لەو پەیمانگایە وەرگرتەوە.. (خەلیل ئیسماعیل) بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٣٧ قورئانی خوێندووە و لە ڕادیۆی سعودیەش چەند

کاسێتێکی تۆمار کردووه و سەرجەم گوێگرانی سەرسام کردووه، چونکه بە ئاوازێکی غەریب و لە ڕادەبەدەر خۆش دەیخوێند.. تەنانەت ئاوازدانەر و مۆسیقاژەنەکانیشی سەرسام کردبوو، بۆنموونە ئاوازدانەر و مۆسیقاژەنی ناوداری عەرەبی (سامی نشوان) لە چاوپێکەوتن و چەند بابەتێك لە بارەی (خەلیل ئیسماعیل) نووسیویەتی: بە چەندین ولآتانی عەرەبیدا گەڕام و سووڕام نەمبیست و نەمبینی کەسێك وەکو ئەو زاتە مەقام زان بێت و مۆرکی نەتەوەکەی بپارێزێت، هەروەها ئەڵێ: ئامۆژگاری ولآتانی عەرەبی و خەڵکانی عێراقی بەتایبەتی دەکەم دەست بەو ڕەسەنایەتییەوە بگرن و ڕێچکەکانی بەرنەدەن، چونکه هەر ئەو مەقام زان و مۆزەخانەی هاوچەرخە ! ! !

بێگومان ئامۆژگارییەکانی ئەم گەورە مۆسیقییە تەواو ڕاستەو کە گوێ لە سورەتی (فصلت) دەگری بە دەنگی (خەلیل ئیسماعیل) بەتایبەتی لەسەرەتای سورەتەکە وا هەست دەکەی ئایەتەکانت بەوێنەوە نیشاندەدات و ڕاڤەی سورەتەکەشت بۆ دەکات، بەتایبەتی لە ئایەتی ﴿ بشيرا ونذيرا فأعرض أكثرهم فهم لايسمعون ﴾. قورئان خوێنانی عێراق

هەموویان قەرزاری ئەو کەڵە قورئانخوێنەن، چونکە لەو فێری خوێندنی قورئان و جۆرەکانی مەقامات بوون، بەتایبەتی مەقاماتی (بەیات و ماهوری و حویزی و بهیزاوی و سەبا).. خوالێخۆشبوو لە شەستەکان و حەفتاکان چەندین جار چۆتە تەلەفزیۆنی عێراق و قورئانی بە وێنەوە تۆمارکردووە کە ئێستاکەش وەکو ئەرشیفێك لە بازاڕەکان دەست دەکەوێ و شەیدایانی دەنگی بە پەرۆشەوە گوێی لێ دەگرن..خولێخۆشبوو لە مانگی نیسانی ساڵی ٢٠٠٢ی زایینی و لە تەمەنی هەشتاو دوو ساڵان کۆچی دوایی کرد..



## ﴿شيخ عبداللطيف العبدلي﴾

ناوی تەواوی (عبد ألللطيف غائب ريحان ألعبدلي )ە، و لەساڵی ١٩٣٥ی زایینی لەفەللوجە لەدایك بووە، لەتەمەنی منداڵیدا لای شێخ عەبدلوەهاب ئەحمەد مەشهەدانی فێری خوێندنی قورئانی پیرۆز بووە.

پاشان لای شێخ حامید حوەیش زیاتر فێری چۆنیەتی خوێندنی قورئانی پیرۆز بووە، لەچلەکان لای شێخ عەبدولستار جومەیلی فێری مەقامات و تەواشیح وتن بووە و سوودی زۆری لەو قورئان خوێنە وەرگرتووە، لەساڵی ١٩٥١ ی زایینی لەمزگەوتی گەورەی رمادی بەقورئان خوێن دامەزراوە.. لەوساڵەدا لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی تیپێکی تەواشیح خوێندنیان دامەزراند و کەلەمیانەیدا لەزۆربەی مزگەوتەکانی ئاهەنگی یادی لەدایك بوونی پێغەمبەری پێشەوایان بەرز رادەگرت و تیپەکەش لەمانە پێکهاتبوون (ولید ابراهیم ، مجید علي

، عبد الكريم محمد حسين ، وشريف جاسم ، ومحمود الكروعي )، بۆیەکەمجار لەساڵی ١٩٧٥ خولێکی فێربوونی تەجویدی بۆ قورئان خوێنان کردەوە و جارێکی تریش لەساڵی ١٩٨٩ ئەو خولەی کردەوە و قورئان خوێنێکی ئێجگار زۆر سوودیان لەخولەکە وەرگرت.

جارێکی تر لەساڵی ١٩٧١ تاوەکو ٢٠٠٠ لەمزگەوتی گەورەی رمادی بە قورئان خوێن دامەزرایەوە، بۆیەکەمجار لە بەرواری ١٩٦٨/٩/٢٨ سەردانی ئێزگەی بەغدای کردو، چەند سورەتێکی لەقورئانی پیرۆز لەو ئێزگەیە بۆتۆمارکرا، قورئان خوێن لەساڵی ١٩٩٥ ی زایینی مۆڵەتی (اصول القراءات السبع ) ی لەلایەن شێخ ئەحمەد ئەلکوبەیسی پێ بەخشراوە، زۆربەی قورئان خوێنە عێراقیەکان لەلای ئەم قورئان خوێنە مۆڵەتیان پێدراوە، قورئان خوێن لەژیانداماوە و جێگری یەکەمی سەرۆکی کۆمەڵەی قورئان خوێنانی عێراقە.



# ﴿ شیخ نعمه الحسان ﷺ ﴾

( نعمـه یعقـوب محمـود الحـسان ) لەسـاڵی ١٩٦٩ ی زایینـی لـەپارێزگای بەسـرە لـەدایك بـووە، لەتەمـەنی شـەش سـاڵان خراوەتە بەر خوێندن لە قوتابخانەی ( الخليل بن أحمد الفراهيـدي ) و پاشان بۆتەواو کردنی قۆناغەکانی ناوەندی و ئامادەیی چۆتە شاری سامەرا و هەرلەوێش خوێندنی ئیسلامیی تەواو کردووە.

بۆخوێندنی قۆناغەکانی زانکۆش چـۆتە بەغـدا و بەشـی زانـستە ئیسلامییەکانی لە کۆلێژی شـەریعەتەواو کـردووە ، و ئێـستاش قوتابی دکتۆرایە لەزانکۆی بەسرە. لـەقۆناغی ناوەنـدی دابـووە کەپێش نوێژی بۆ نوێژخوێنان کردووە و، لەکۆمـەڵێك مزگـەوتی بەغدا و سامەڕا و بەسـرە پـێش نوێـژی کـردووە بەتایبـەتی تـر لەنوێژەکانی تەراویحی مانگی رەمـەزانی پـیرۆز. دواتـر لەسـاڵی ١٩٩٥ بەپێشنوێژخوێنی مزگەوتی گـەورەی بەسـرە دامـەزراوە،

لەساڵی ٢٠٠٣ چۆتە دەوڵەتی کوێت و لەوێ بەپێش نوێـژخوێنی مزگەوتی (العلبـــــــان ) دامەزراوە، قورئان خوێن لای شـێخ ( عوسمان کوردی ) لەکۆلێژی شـەریعەی بەغـدا مۆڵـەتی قورئـان خوێندنی پێدراوە لەسەر ریوایەتی ( حفص عـن عاصم )، قورئان خوێن لەنوێـژەکانی تـەراویحی سـاڵی ٢٠٠٣ خـەتمێکی قورئـانی پیرۆزی بەریوایەتی ( حفص عـن عاصم ) بۆتۆمارکراوە .

## سەرچاوەکان:

هەندێك زانیاریم لە قورئان خوێن ( محمد جبريل ) وەرگرتووە لەرێی ئیمێلی خۆم ، لەگەڵ دیمانەی ناوبراو لەگەڵ کەناڵی الفجر ( بەرنامەی یوم فی حیاة قاريء ٢٠٠٧/٥/١٤ )

پرسیاری تایبەتی خۆم لەدکتۆر عبدالفتاح الطاروطي لەرێی ئیمێل و تەلەفۆن .

گۆڤاری ( الفتاوی لەساڵی ١٩٨٩ کەتیشکی خستۆتە سەربەشێك لەژیانی حافز خەلیل) .

دیمانەی رادیۆی قاهیرە لەگەڵ بنەماڵەی شێخ محەممەد سدیق ئەلمەنشاوی .

چاوپێکەوتنی شیخ عەبدولباست عەبدولسەمەد لەگەڵ رادیۆی قورئان دەنگی قاهیرە لەساڵی ١٩٨٤ .

کەناڵی ئاسمانی المجد.

دیداری قورئان خوێنان ( ابوبکر الشاطري ، سعدالغامدي ، محمد جبريل ، عبدالفتاح الطاروطي ) لەگەڵ کـەناڵی ( الفجر ) لەبەرنامەی ( یوم في حیاة قاريء ).

دیداری هەندێك لە قورئان خوێنان کە لە ژیاندا ماون .

ئینتەرنێت ( ماڵپەری محمدجبریل / مشاری العفاسی / عبدالفتاح الطاروطي / مزامیر داود / qooran.com / ماڵپەری قورئان خوێن عادل الکلبانی / ماڵپەری توفیق الصائغ / ماڵپەری سعود الشریم / ماڵپەری شێرزاد عبدالرحمن / ماڵپەری دکتۆر عبدالعزیز الاحمد / ماڵپـــــــــــــەری عبدالباسط عبدالصمد ، ماڵپەری شعبان الصیاد ، ماڵپەری علی عبدالله جابر ، ماڵپەری ماهر المعیقلی ).





١- مەنشاوی عەبدولباست لەئەندەنوسیا ساڵی ١٩٥٥

٢- مەنشاولەتەمەنی ٢٧ سالان



٣- محمد صديق المنشاوى و محمود خليل الحصرى١٩٦٦



٤- محمد صديق المنشاوى ستوديو مصر ١٩٦٣



٥- محمد صديق المنشاوى ١٩٦٤



مؤتمر اتحاد قراء العالم في كراتشي – باكستان سنة 1967

٦– عبدالباسط عبدالصمد و محمود خليل الحصري باكستان ١٩٦٧



٧- عبدالباسط یەکەم قورئان خوێنی شوفێر١٩٥٦



٨-عبدالباسط لەگەڵ دراوسێکانی لەئەسکەندەریە ١٩٧٤



٩- لەبەردەم مزگەوتەکەی ساڵی ١٩٨١ ی زایینی .



١٠-عبدالباسط لەکاتی خوێندنی سورەتی الانفال ستۆدیۆی تەلەفزیۆنی میسر ١٩٧٥



١١- لەگەڵ برا و منداڵەکانی خۆی ١٩٧٣

## وتەی کۆتـایی ئامادەکارو وەرگێر :

دوای حەمـد و سـەنام بۆخـوای گـەورە و میهرەبـان، هـەزاران شـوکر بـۆ ئەوخوایـەی کەتەنهایـە و خـاوەن دەسـەلأتە بەسـەر هەمووشتێکەوە و بالأدەستیشە بەسـەر کاروبارەکـانی رۆژانـەی جیهـان، پـشت بـەخوای گـەورە تـوانیم ژیـانی زۆربـەی قورئـان خوێنــەکانی جیهــانی ئیــسلامیی لەکتێبێکـدا کۆبکەمــەوە و بەچاپی بگەیەنم گەورەیی ژیانی ئەو قورئان خوێنانـە و دەنگـە بەسۆزەکانیان وایلێکردم کە هەوڵ بدەم ژیانی سەرجەمیان لەم کتێبە کۆبکەمەوە و وەریبگێڕمە سەر زمـانی شـیرینی کـوردی، چـونکە بـەهۆی ئـەو قورئـان خوێنانەوەیـە کـە ئـەمڕۆ ئێمـە و سەرجەم موسـڵمانانی جیهـان فێـری خوێنـدنی قورئـانی پـیرۆز بـووین و پێویـستە لەهـەموو کـات و سـاتێك نـزای خێریـان بـۆ بکەین و بیان کەینە پێشەنگی خۆمان خوای گـەورە لـەقورئانی پـیرۆزدا فەرموویـەتی ﴿ إنـانحن نزلنـا الذكــــر وإنـا لـه لحـافظون ﴾ ... هەرچەندەی خوای گـەورە خـۆی بڕیاریـداوە کـە خـۆی پارێزگـاری لەوپەیامـە پـیرۆزە دەکـات کـە قورئـانی پـیرۆزە ئـەوا بێگومـان قورئـان خوێنـان و قوتابیـانی قورئـانی

پیرۆزیش ئەم ئەمانەتە خواییەیان لەئەستۆگرتووە و توانیویانە دەست بەقورئانی پیرۆز بگرن و پارێزگاری لێبکەن، بەلاَم چ پارێزگاریەکی مەزن و پیرۆز... ئەی ئەوەتە نییە بەهۆی دەنگی ئەو قورئان خوێنانە ئەم پەیامە ئاسمانییە پارێزراوە و لەئەرشیفی نەمری قورگیان و لەبلاَوکراوەی کۆمپانیاکان قورئانی پیرۆز بەرز و پیرۆز ڕاگیراوە و هەر بەبەرز و پیرۆزیش دەمێنێتەوە.

لەسەرەهەمووقوتابییەکی قورئانی پیرۆز پێویستە نزای خێر بۆئەو قورئان خوێنانە بکات و لەخوای گەورە خوازیاربێت بەورۆژەیان بگەیەنێت کە فریشتەکان لەبەهەشتدا ڕوویان تێدەکەن و پێیان دەڵێن ( إقرأ وارتقي ورتل كما ترتل في الدنيا ) ... بزانە چەندە مەقامێکی بەرز و پیرۆزیان دەستدەکەوێت لەبەهەشتی نەبڕاوە کەفریشتەکان ڕوولە قورئان خوێنەکان دەکەن و پێیان دەڵێن : بخوێنن وەکو ئەو کاتانەی لەدنیا دەتانخوێند ...!!! ئەمە مەقام و مەنزڵی بەرزیان بێت لەبەهەشتدا ئەی دەبێ لەم دنیایەدا چ پاداشتێکی خوای گەورەیان بەسەرداڕژابێت؟؟

هەزاران سەلام و ڕەحمەتی خوای گەورە لەسەرگیانی پیرۆزی ئەو قورئان خوێنانە بێت و لەخوای گەورەش داواکارم کە ئێوەش بتوانن سوودێك لەژیانی ئەو قورئان خوێنانە وەربگرن، کەبێگومان هەموولایەکمان گوێمان لەدەنگە بەسۆزەکانیان بووە وتامەزرۆی شارەزابوونیان بووین لەژیانی پڕ فەڕیان، هەربۆیە هەڵی زۆرترمدا بۆ دۆزینەوە و کۆکردنەوەی ژیانی زۆربەی قورئان خوێنەکان کەنزیکەی حەوت ساڵ گەڕان بووم بۆ دۆزینەوەی ژیانیان لەهەموو سەرچاوەیەك کە هەوڵمدا بەدەستیان بهێنم و پێشکەشی خوێنەرانی بکەم، داواکارم خوێنەران لە نزای خێر بێبەشـــــم نەکەن ...

والسلام عليكم ورحمةالله وبركاته .

صهيب جميل علي

هەرێمی کوردستانی عێراق / هەولێر

١٥/٨/٢٠٠٨-١٤شەعبانی ١٤٢٩

جارێکی تر دوای هەوڵێکی زۆر توانیم ژیانی زۆربەی قورئان خوێنەکانی جیهانی ئیسلامیی کۆبکەمەوەو بە چاپی بگەیەنم، گەورەیی ژیانی ئەوان وای لێکردم کە هەوڵی زیاتر بدەم ژیانی سەرجەمیان کۆبکەمەوەو بۆ خوێنەران وەری بگێرمە سەر زمانی شیرینی کوردی.

ئامادەکار و وەرگێڕ


بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ: فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢ ٣٣ ٨٦٨
hawlerchap@yahoo.com
عێراق - کوردستان - هەولێر

نرخی ٣٠٠٠ دینارە

چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر